# ڕێگای باڵابوون



د. ابراهيم الفقى

وەرگێڕانی:
بەختیار ئەحمەد سالح

2013

Scanned with CamScanner

238 posts | 19.2k followers | 7 following

Promote | Edit Profile

📚 پەرەی فەرمی 📚 کتێبی PDF

Public Figure

لێرە

باشترین و بەسوودترین و پڕ خوێنەرترین کتێبەکان

بە خۆڕایی و بە شێوەی PDF داگرە

.

Ganjyna

.

لینکی کتێبەکان 👇 ئەم لینکە بکەرەوە بۆ داگرتنی کتێبەکان

drive.google.com/folderview?id=1gk8e3nSJGJLu36xeLUjwdbjgTSVslbo_

Ktebi_PDF



Scanned with CamScanner

# ڕێگای بالابوون

نوسینی: د. ئیراهیم فەقێ

لە عەرەبی یەوە

بەختیار ئەحمەد سالح

چاپی دووەم

٢٠١٣

Scanned with CamScanner

لە بڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما
زنجیرە (٢٥٦)

## ناسنامەی کتێب

- ناوی کتێب: ڕێگای باڵا بوون
- بابەت: دەروونزانی.
- نوسینی: ئیبراهیم فەقێ.
- وەرگێڕانی: بەختیار ئەحمەد ساڵح.
- تایپ: ئەزیتا جەمال غەفور.
- دیزاین و بەرگ: فواد کەوڵۆسی
- شوێنی چاپ: چاپەمەنی گەنج.
- ساڵی چاپ: ٢٠١٠ سلێمانی
- نۆرەی چاپ: چاپی دووەم
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە.

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە سپاردنی (١٠٨٧)ی ساڵی ٢٠١٠ی پێدراوە

ناونیشان: سلێمانی - بازاڕی سلێمانی - بەرامبەر بازاڕی خەفاف.
ژمارە مۆبایل: (٠٧٧٠١٥٧٤٢٩٣) (٠٧٥٠١١٩١٨٤٧)

Scanned with CamScanner

# پێڕست


ڕێگەی باڵا بوون ........ ٥
پەیوەندی کردن بە خواوەندەوە ........ ٣٠
خۆشویستن لەڕێی خواوەند دا........ ٣٤
بەخشین ........ ٣٧
باوەڕهێنان بە خواوەند ........ ٣٨
گوێ ڕایەڵی:........ ٤٢
نوێژکردن........ ٤٤
نیەت پاکی ........ ٤٨
دڵسۆزی ........ ٥٠
پشت بەستن بە خواوەند........ ٥٤
گەشبینی ........ ٥٦
پاڕانەوە و زیکر کردن........ ٥٧
ئاکار........ ٥٩
هاوسۆزی ........ ٦٩
پێ کەنین........ ٧٠
لێ خۆشبوون........ ٧٥
بلێ کار بکەن........ ٨٩
ئامانجەکان........ ٩٩
یەکەم: خوێندنەوە: ........ ١٠٣
دووەم: گوێ گرتن........ ١٠٥
سێ هەم: بینین ........ ١٠٦
چوارەم: ئامادەکاری........ ١٠٧

# ڕێگەی باڵا بوون

باشە ئەبێت هۆی سەرکەوتنی هەندێك کەس و سەرنەکەوتنی هەندێکی تر بگەڕێتەوە بۆچی؟! جیاوازی کەسە سەرکەوتووە کان لە چی دایە و بە چی جیا ئەکرێنەوە؟! هەندێك ژیانی بەباشترین شێوە ئەباتە سەر و خەون و ئامانجەکانیان بەدی دەهێنن لە کاتێکا کەسانێك هەن کە بە پێچەوانەوەن؟! ئایا ئەو کەسانەی کە بە پێی خواست و ئارەزووی خۆیان ناژین و خەون و ئامانجەکانیان بەدی ناهێنن نایانەوێت ئاسوودە بژین؟! نایانەوێت کەسێکی باڵا بن؟! بەدڵنیاییەوە نەخێر ... کەواتە جیاوازی نێوان ئەو دوو تیمە لە چی دایە؟! لەوکاتەوەی کە خواوەند ئادەمی دروست کرد، کۆی مرۆڤەکان لەچوار بەشدا یەك دەگرنەوە:

١. کەرەستە خاوەکان: واتە پێنج هەستیارەکە.

٢. کات: (١٤٤٠) خولەك یاخود (٢٤) کاتژمێر لە ڕۆژێك دا.

٣. بیر: کۆی مرۆڤایەتی لە بیردا یەك دەگرنەوە لەبەر ئەوەی خواوەند هۆش و لۆژیك و توانای بیرکردنەوەی پێ بەخشیوین.

٤. ووزە: دەرهاویشتەی بیر و لۆژیك و لێکدانەوەیە.



Scanned with CamScanner

باشە هەر مرۆڤێك گەر خاوەنی ئەم بەهرانە بێت، هۆی چی یە کە هەندێك کەس سەرکەوتوون و هەندێکی دیکەش نا؟! گەر مرۆڤەکان تێکڕا کاریگەر بن بەکات و شوێن و مادە و ووزە، هۆی چی یە کە هەندێك کەس باشترن لەچاو هەندێکی تردا؟!

هۆکاری ئەم جیاوازی یە زۆر سانایە، مرۆڤی بالاّ کەرەستەی خاو و کات و بیرکردنەوە و ووزەی خۆی بەکار دەهێنێت بۆئەوەی لەسەر ڕێگەی بالاّبوون بەردەوام بێت . بەلاّم ئایا ئەوی دی هەمان پلانی نی یە؟! بە دلّنیایی یەوە نەخێر، چونکە نازانێت ئەو کارەی کەدەیکات نایگەیەنێت بەوەی کە دەیخوازێت، ئەو هەلّدەستێت بەکار گەلێك و پێی وایە ئەو کارانە دەی گەیەنێت بە ئاسودەیی.

ڕەنگە خوێنکارێکت پێش چاو کەوێت کە گرنگی بە خوێندن نادات و تەنانەت ناشچێت بۆ خوێندنگە، یاخود ڕەنگە کرێکارێت پێش چاو بکەوێت بەشێویەك کار ناکات کە خواوەند لێی ڕازی بێت و ئەبینیت هەمیشە ئەنالّێنێ بۆلّە بۆلّی یەت لەبەر خۆیەوە و خۆی بەراود دەکات لەگەلّ ئەو کەسانەدا کە خواوەند دەرووی لێ کردوونەتەوە، ئەم کەسە ڕەخنە لە مرۆڤی بالاّ دەگرێت و لە بەهای کەم دەکاتەوە. بەلاّم مرۆڤی بالاّ بۆ ئەوەی لەسەر بالاّ بوون بەردوام بێت هەلّدەستێت بە بەکارهێنانی کەرەستەی خاو و کات و بیر و توانا و ووزەکانی. گەر دووچاری گرفتێك بێت، دەست بەجێ بیر لە چارەسەرکردنی دەکاتەوە گەر ڕووبەڕووی بەربەرکانێ یەك بێتەوە لە بەرامبەری دا

دەوەستێتەوە، پشت بە خواوەند دەبەستێت و ڕەزامەندە بەوەی کە پێی بەخشی وە. بەڵام ئەوی دی، بە بەردەوامی کینە لە دڵە، نکۆڵی دەکات لەوەی کە هەیەتی، هیچ کات ڕەزامەند نابێت بەوەی کە خواوەند پێی بەخشیووە.

ووشەی ڕەزامەند بوون بەمانای ڕەزامەند بوونە بەوەی کە خواەند بەخشیوویەتی، بەم پێ یە کەسەکە لێرەوە ڕێگەی باڵا بوون دەگرێتە بەر تا بەرەو پێش بچێت. ئەمە گەنجێکی ناڕازی لەخێزانەکەیم بیردەخاتەوە کاتێك کەلە زانکۆ بوو، ئەم گەنجە ناڕازی بوو لەو گەڕەکەی. کە تیایدا دەژیا، بە هیچ شێوەیەك لە ژیانی خۆی ڕازی نەبوو. ژیانی پێك هاتبوو لە زنجیرەیەك کێشە و دەردەسەری، بەڵام لە ناخی دا شتێك هەبوو کە پێی دەووت کە مرۆڤێکی باڵایە، بەڵام نەی دەتوانی پەی بە ڕێگەی باڵابوون بەرێ.

ڕۆژێك لەکەنار دەریادا ڕێی دەکرد لەناکاو کەسێك دەست دەخاتە سەرشانی، گەنجەکە ئاوڕ دەداتەوە و دەبینێت کە یەکێك لە ئەندامانی خێزانەکەیەتی، پێی ئەڵێت: من زۆر خەمبارم.... کەسەکە پێی دەڵێت: ئێمە دەزانین کە ژیانت سەرتاسەر کێشەو دەردی سەریە، گەنجەکە پێی دەڵێت: من لە خۆم ڕازی نیم، ناشزانم چی بکەم، بەڵام ئەزانم کە من دەتوانم کەسێکی جیاوازتر بم لەوەی کە هەم. بۆ ئەبێت کەسانێکی تر لە ژیانی کاری و زانستی و کەسایەتی و هاوسەرێتی و کۆمەڵایەتی دا سەرکەوتووبن و من نەتوانم ؟! بۆچی ئەو کەسە دەوڵەمەندانە ئەو

گشته سامانەیان هەبێت و من خاوەنی هیچ نەبم؟! من ئەزانم كە ئەتوانم سەركەوتن بە دەست بهێنم، تەنها شتێك كە من پێویستم پێی بێت كەسێكە ڕێنمایی ئەو ڕێگەیەم بكات.

كەسەكە سەیرێكی كردو پێی ووت: هەر یەكێك لە ئێمە خاوەن بەهرە و توان و جیاوازین، لەبەر ئەوەی خواوەند هەر بەو شێوەیە ئێمەی ئەفراندووە. خواوەند لە سورەتی (التین) ئایەتی "٤" دا دەفەرموێت ﴿بەڕاستی ئێمە مرۆڤمان لە جوانترین شێوە و باشترین شێوازدا ئەفراندووە﴾. هەر بۆیە خواوەن هەرچی لە نێوان ئاسمان و زەوی دایە خستۆتە خزمەت ئێمەوە. خواوەند لە سورەتی (لقمان) ئایەتی "٢٠" دا دەفەرموێت ﴿ئایا سەرنجی ئەوەتان نەداوە كە هەرچی لە نێوان ئاسمان و زەوی دایە خواوەند هەمووی خستۆتە خزمەتی ئێوەوە و ناز و نیعمەتی ئاشكراو شاراوەی بەسەردا باراندون﴾. بەلاّم سەرجەم ئەم كارانە لە بەرامبەر كێشمە كێشەكانی ژیاندا لە یاد دەكرێن، ئێمە خواستمان هەیە بەلاّم زۆربەمان هیچ ناكەین بۆ دەستخستنی خواستەكانمان... دواتر كەسەكە لێی نزیكتر بۆوە و لەچاوی ڕوانی پێی ووت: ڕێگەی بالاّ بوون لەبەردەمماندایە و ئێمەین نایبینین، بەلاّم من بە یاری یەزدان كۆمەكت ئەكەم، چونكە من كەسێكی زۆر داناو حكیم دەناسم كە دەتوانێت بۆ ڕێی ڕاست ڕێنوێنیت كات بۆ گەیشتن بە سەركەوتن، بەلاّم ڕەنگە بۆ گەیشتن بەو كەسە زۆر ماندوو بیت.... گەنجەكە دەست بەجێ وەلاّمی دایەوە: من لەوپەڕی

ئامادەگیدام بۆ ئەنجام دانی هەر شتێك كە بمگەیەنێت بەڕێگەی باڵا بوون... كەسەكە پێی ووت: ئەوكەسەی كە باسم لێوەكرد لە یەكێك لە چیاكاندا ژیان بەسەر دەبات، تەنها لە ڕێی پیادەوەیە كە دەتوانیت پێی بگەیت. گەنجەكە وەڵامی دایەوە: بەپێ ئەڕۆم، بە چیاكەش دا سەر ئەكەوم، بەرگەی سەختیش دەگرم تا پێی ئەگەم... كەسەكە ووتی: ئەو زۆر دوورە، ناچاریت گەشتی بۆ بكەیت.... وەڵامی دایەوە: من ئامادەم گەشتی بۆ بكەم. وەڵامی دایەوە: بەڵام ئەو گەشتە لەسەرت دەكەوێت... پێی ووت: هەر شتێك لە توانامدا بێت ئامادەم بیكەم تەنها بۆ گەیشتن بەوكەسە دانایە... پیاوەكە هەستا بە پێدانی ناونیشانی شوێنی نیشتەجێ بوونی كەسە داناكە، ئەو شوێنە چەند میلێك دوور بوو، جگەلەوەی كە دوای ماندوو بوونێكی زۆر بەو شوێنە دەگەیت، دەبێت توانای مادیشت هەبێت بۆ ئەوەی بە فڕۆكە گەشتی بۆ بكەیت، لەسەرووی هەموو ئەمانەشەوە، پێویستە بۆ ئەو گەشتەت پلانت هەبێت. گەنجەكە پێی ووت: كارەكە بە ڕاستی سەخت و دژوارە، بەڵام ئەو ئەركە ئەوەندە ئەهێنێت كە بەرگەی ئەو هەموو سەختیە بگرم تا دەگەم بەوكەسە دانایە و ئەگەمە سەر ڕێگەی باڵا بوون. پیاوەكە هەستی بە ڕاستی هیمەتی گەنجەكە كرد، لە چاوەكانی دا ئارەزوویەكی گڕ گرتوو هەبوو بۆ ئەوەی چاوی بەو كەسە دانایە بكەوێت. گەنجەكە لەو باوەڕەدا نەبوو كە دواجار بتوانێت گومكراوەكەی بدۆزێتەوە و چاوی بەو كەسە بكەوێت كە دەیخاتە سەر ڕێگەی باڵابوون؟ لەبەر

ڕەخساندنی ئەو هەلە بەنرخە و نیشاندانی ئەو ڕێگەیە گەنجەکە زۆر سوپاسی ئەوکەسەی کرد.

گەنجەکە بە درێژایی شەو بیری لەوە دەکردەوە کەچی بکات، ئەو پێویستی بە پارەی زۆر بوو، بەشێوەیەك پلانی بۆ خۆی دانا کەلە ماوەی مانگێك دا چاوی بەم کەسە بکەوێت، نامەیەکی بۆ نارد و تیایدا ئەوەی ڕوون کردەوە کە دەیەوێت بیبینێت، ئەو کەسەش بە نامەیەك ڕەزامەندی خۆی بۆ بینینەکە دەربڕی. گەنجەکە دەستی کرد بەخۆ ئامادەکردن بۆ ئەم گەشتە، بۆ ئەوەی پارەی پێویستی دەست بکەوێت بۆ گەشتەکەی، سەرەتا لە هەر بوارێك دا کە بۆی لوا دەستی کرد بە کار کردن. بۆنمونە هەڵدەستا بە پاك کردنەوەی نوسینگە و کورسیەکان، پاسەوانی دەکرد بەدرێژایی شەو، هیچ کاتێکی بە فیڕۆ نەدەدا، لەگەڵ کار کردنە کەشی دا هەوڵی دەدا لە خوێندن دا سەرکەوتوو بێت و بڕوانامەکەی بە دەست بهێنێت، دوای ئەوەی کە کارەکەشی ئەنجام داو توانی سەرکەوێت و بڕوانامەکەی بە دەست بهێنێت، پارەیەکی زۆری پاشەکەوت کرد، تا ئەو کاتەش باوەڕی نەبوو کە توانیویەتی بلیتی سەفەر کردنەکەی ببڕێت و ئەتوانێت گەشت بکات و ئەو کەسە دانایە ببینێت کە چاوەڕوانی ببینیی دەکرد. کاتێك کە سواری فڕۆکەکە بوو چاوەکانی لێك نا، خەوی بەو ڕۆژەوە دەبینی کە تیایدا مرۆڤێکی بالآیە. هەستی کرد کە ئەو ئێستا لەسەر ڕێگەی مرۆڤی بالآیە، دواتر چاوی کردەوە و سەیری دەرەوەی کرد و هەورەکانی بەدی کرد، نوقم

بوو لە ناو ئەو دیمەنە جوانەدا، لەوە ڕاما کە چۆن یەزدان یارمەتی داوە تا گەیشتووە بە ئەمێستا، دواتر فڕۆکەوانەکە ڕای گەیاند کە بە یاری یەزدان گەیشتوون، گەنجەکە تا ئەو کاتەش باوەڕی وانەبوو کە گەیشتبێتە ئەو شوێنەی کەتیایدا بتوانێت کەسی دانا ببینێت و دوای چەند ساتێك دەیخاتە سەر ڕێگای باڵا بوون. زۆر بە خێرایی لە فڕۆکەکە دابەزی و ئۆتۆمبیلێکی بە کرێ گرت، پارەی زۆر پێ نەبوو، کاتێکیش کە گەیشتە نزیك چیاکە سەرسامانە بینی کە چیاکە زۆر گەورەیە و ڕەنگە بۆ گەیشتن بە لووتکەکەی ڕۆژێکی تەواوی بووێت، بەڵام ئەوکاتی لە دەست نەدا، بەڵکو دەستی بە سەرکەوتن کرد و جانتایەکی پێ بوو کە گشت پێداویستی یەکانی تێدا بوو، دوای تێ پەڕاندنی ڕۆژێکی تەواو سەخت خۆی گەیاندە لوتکەی چیاکە. لەوێ خانوویەکی بچووکی پێش چاو کەوت، بەپەلە خۆی گەیاندە دەرگاکە و تا ئەو کاتەش لەو بڕوایەدا نەبوو کە توانیویەتی بگاتە کەسە داناکە و تا دوای چەند چرکەیەکی دیکە ڕووبەڕووی دەبێتەوە. دوای ئەوەی لە دەرگاکەی دا ژنێکی بە تەمەنی لەبەردەم خۆی دا بینی یەوە کە تەمەنی لە (٨٠) ساڵ کەمتر نەبوو، ژنە بە تەمەنەکە سەیرێکی کردو پێی ووت: تۆ کێیت؟! ئەویش لەوەڵامدا ووتی: من پێشتر وادەی یەکتر بینینم داناوە لەگەڵ کەسی دانا دا، من ئەو گەنجەم کە ماوەیەك لەمەو بەر ئەونامەیەم نارد و داوای بینینی کەسی دانام کرد، ئێستا ئەتوانم بیبینم؟ ژنەکە وەڵامی دایەوە: دوا کەووتیت. دەستبەجێ گەنجەکە

وەڵامی دایەوە: من دوانەکەوتم، من لەکاتی دیاری کراودا هاتم. ژنە بە تەمەنەکە پێی ووت: کەسی دانا زیادتر لەیەك مانگ لە هیچ شوێنێك دا نامێنێتەوە، بۆ ماوەی مانگ ونیوێك لەگەڵمان بوو، لەبەر ئەوە تۆ پێویستە بگەڕێیتەوە، ووریابە دوانەکەویت...

گەنجەکە بە هەستێکی پڕ لە ئازاری لە دەست دانی ئەو هەلەی کە ماوەیەکی زۆرە چاوەڕوانی دەکرد سەیرێکی کرد. لەوپەڕی بێزاری وخەمدا بوو، بەلاّم هیچ هەڵبژادەیەکی دیکەی لەبەر دەستا نەبوو. لەسەر چیاکە هاتە خوارەوە و دووبارە گەڕایەوە بۆ شارەکەی خۆی ، بەلاّم ئەو ئێستا چی بکات کاتێك کە هیچ پارەیەکی پێ نیە؟! دووبارە هەستی کرد کە ئومێدی لە دەست دەدات، بەلاّم لە ناخی دا دەنگێك هەبوو کە دەی ووت: نائومێد مەبە، لەبەر ئەوەی نەژیان لەگەڵ نا ئومێدی هەڵدەکا و نە نائومێدیش لەگەڵ ژیاندا.

لێرەوە دووبارە دەستی کردەوە بە بیر کردنەوە لەوەی کە دەست بەکاربێتەوە، هەر بەو شێوەیەش بوو، دووبارە دەستی بەکار کردەوە، بەشەو و بەرۆژ کاری دەکرد تەنها ساتێکی بە فیڕۆ نەدەدا، کاتی چاوپێ کەوتنی لەگەڵ کەسی دانادا نزیك بوەوە، پارەی پێویستی بۆ سەفەر کردنەکەی کۆکردەوە و سواری فڕۆکەکەی بوو، دووبارە سەفەرە سەختەکەی دەست پێ کردەوە، پاڵنەری هیوا و ئارەزووەکانی بوو، بە تایبەت ئەمجارە لە وادەی خۆی دا هاتبوو، دووبارە بە سەر چیاکەدا سەر کەوت و جانتاکەشی پێ بوو، لە دەرگای دا، دووبارە هەمان ژنی

بەتەمەن دەرگاکەی لێ کردەوە و دووبارە پێی ووت: دواکەووتیت، لەبەر ئەوەی کەسی دانا زیاد لە مانگێك لە هیچ شوێنێکا نامێنێتەوە، لێرە زۆر مایەوە، تۆ دواکەووتیت.... گەنجەکە ووتی: بەڵام من نامەیەکم بۆ نارد و کاتی هاتنەکەمم پێ ڕاگەیاندن. ژنە بەتەمەنەکە ووتی: بەڵام دواکەوتی، ئەو چاوەڕوان ناکات، ئەبێت دوای مانگێکی دیکە بگەڕێیتەوە. گەنجەکە پێی ووت: ئەمە شێتانەیە.... پێ ناچێت ئەم پیاوە دانا بێت، ئەو پەیمانی خۆی ناباتەسەر، ڕێزی کات ناگرێت، تەنانەت نە ڕێز لە خەڵکی دەگرێت و نە ڕێز لە کاتەکەشیان، ئەو بە ئارەزووی خۆی دێت و دەچێت، من نامەی بۆ دەنێرم، ئەی چی بکەم، چاوەڕوانی چی ئەکرێت کە من بیکەم؟! لەگەڵ ووتنی ئەم قسەیە دا سەیری ژنە بەتەمەنەکەی دەکرد و پرسیاری ئەوەی دەکرد کە چی بکات.... ژنە بەتەمەنەکەش بەو پەڕی هێمنی یەوە ووتی: ڕەنگە تووڕە بیت، ڕەنگە خەم دات بگرێت، ڕەنگە هەڵیش چیت، بەڵام ئەم کارەی تۆ هیچ گۆڕانێك دروست ناکات، بگەڕێرەوە و بیر بکەرەوە و لەکاتی گونجاودا وەرەوە... دواتر دەرگاکەی داخست و ڕۆیشت. ئەم جارە گەنجەکە زۆر بەتوڕەیی گەڕایەوە، هیچ پارەی پێ نەمابوو، لەناخی خۆی دا بڕیاری دابوو کە ئیدی نەگەڕێتەوە، لەبەر ئەوەی گەر جارێکی دی بگەڕێتەوە، هەمان هەڵوێستی لەگەڵ دا دووبارە دەبێتەوە. بۆ ماوەی هەفتەیەك بەم شێوەیە مایەوە... لە ڕووی دەروونی یەوە



Scanned with CamScanner

ئازاری دەکێشا، قسەی لەگەڵ کەس نەدەکرد، ڕێگەی بە کەس نەدەدا ببینێت جا ئیتر ئەو کەسە هەر کەسێك بوایە.

هەر لەم حاڵەتەدا مایەوە بە ڕادەیەك کە بە بەردەوامی دەگریا، دوای بیر لێ کردنەوەیەکی قووڵ ، بڕیاری دا دووبارە ئەزموونەکە دووبارە بکاتەوە، دووبارە شەو و ڕۆژ دەستی کردەوە بە کار کردن، کاتی بەفیڕۆ نەدا تا پارەی پێویستی بەدەست هێنا، دووبارە سەفەری کردەوە، دووبارە بەسەر چیاکەدا سەرکەوت، کاتێکیش کە لەدەرگاکەی دا، دوبارە ئەوەی چاوەڕوانی نەدەکرد ڕووی دا، لەبەر ئەوەی هەر هەمان ئافرەتی بینیەوە کە پێی ووت: تۆ چوار کاتژمێر دوا کەووتیت لەبەر ئەوە کەسی داناش ڕۆیشت..... گەنجەکە بە تووڕەبی یەوە پێی ووت: ئەمە زۆر ناماقووڵە... ئەم پیاوە زۆر ئەستەمە کەمترین دانایی هەبێت...

ژنە بەتەمەنەکە پێی ووت: پێویست بە هەڵە کردن ناکات... گەنجەکە ووتی: پێویستە من هەڵە بکەم، لەبەر ئەوەی ئەم پیاوە خاوەن کەمترین هەستە سەبارەت بەوانی دی. ژنە بەتەمەنەکە پێی ووت: جگە لە گەڕانەوە هیچ هەڵبژاردەیەکی دیکەت لەبەردەمدا نی یە، گەر بیریشت لەوە کردەوە کە جارێکی تر بگەڕێیتەوە ، باشتر وایە کەبەر لە وادەکەی خۆت بێیت، تا چاوەڕوانی کەیت و چاوت پێی بکەوێت... تێبینی کرد ئەم جارەش هەروەك جارەکانی دیکە فەرمانی پێ دا کە بگەڕێتەوە، بەڵام ئەم جارەیان ڕێگەکەی پیشان داو پێی ووت کە چی بکات و دەرگایەکی ئومێدی بەڕووی دا کردەوە. گەنجەکە

گەڕایەوە و دووبارە هەر لە یەکەمین ڕۆژەوە دەستی بەکارکردن کردەوە، بەشەو ڕۆژ کاری دەکرد، توانی پارەی پێویست کۆبکاتەوە، سەفەری کردو و دووبارە بە چیادا سەرکەوت، لە دەرگای دا، ئەم جارە هەفتەیەك زووتر هات، بۆ ماوەی هەفتەیەك لەو شوێنە چۆڵە دا لە دەرەوەی خانووەکە مایەوە دوای تێ پەڕ بوونی هەفتەکە، کەسی دانای بینی کە بە بەردەمی دا تێ دەپەڕێ، بە پەلە خۆی گەیاندێ تاقسەی لەگەڵ دا بکات، دووبارە ژنە بەتەمەنەکە هاتە بەردەمی و پێی ووت: پێت وایە تەنها تۆیت کە چاوەڕوانی دەکەیت؟! پێویستە سەرە بگریت... گەنجەکە بۆماوەی چوار کاتژمێری دیکە لەسەر چیاکە مایەوە، دوای چاوەڕوانی کردنێکی زۆر لە شوێنەکەی خۆی دا دانیشت و دەستی کرد بە گریان، لەناکاو هەستی کرد کە دەستێك بەشانی دا ئەکێشێت، دەستێك کە لێوان لێو بوو لە دانایی، چاوی کردەوە و لە دەوروبەری خۆی نواڕی، بینی کەسی دانا لەتەنیشتی یەوە ڕاوەستاوە. بە بینینی کەسی دانا هەرچی ماندوێتی و ناخۆشی بوو لەبیری چووەوە، ئەمە سروشتی مرۆڤە، هەر ئەوەندەی کەسەرکەوتی بەدەست هێنا، هەموو ماندوو بوونەکانی پێشووتری لەیاد دەکات و دەڵێت: لەم ڕێگەیەدا زۆرماندوو بووم، بەڵام ئێستا من شایەنی ئەم سەرکەوتنەم.

لێرەدا کەسە داناکە پێی ووت: پێم بڵێ گەنج... چیت دەوێت؟؟

پێی ووت: زۆرماندوو بووم، سەختیم زۆر کێشاوە .

کەسی دانا: ئەزانم....

گەنجەکە ووتی: ئەمەوێت ڕێگەی مرۆڤی باڵام نیشان بدەیت.

کەسی دانا: لەدەوروبەری خۆت وورد بەرەوە، تۆ ئێستا لەسەر ئەو ڕێگەیەی... ڕێگەی مرۆڤی باڵا، بەڵام پێ نازانیت.... دواتر پێی ووت: کاتێك کە بۆیەکەمین جار هاتیت بۆ ئێرە پلانت دانا؟!

وەڵامی دایەوە: بەڵێ

پێی ووت: بیرت کردەوە و کارت کرد؟!

وەڵامی دایەوە: بەڵێ بەدڵنیاییەوە.

پێی ووت: پارەشت پاشەکەوت کرد؟!

وەڵامی دایەوە: بەڵێ

پێی ووت: بەرچاویشت ڕوونە؟!

وەڵامی دایەوە : بەڵێ .

پێی ووت: سواری فڕۆکەش بوویت و هاتیت بۆ ئێرە.

وەڵامی دایە: بەڵێ .

پێی ووت: هاتیت بۆ وولاتێك کە هیچی لە بارەیەوە نازانیت و چاوەڕوانیشت دەکەرد کە هەر شتێکت بەسەر بێت؟!

وەڵامی دایەوە: بەڵێ .

پێی ووت: گەر فڕۆکەشت دەست نەکەوتایە، بێ گومان بەدوای کەرەسەی تردا دەگەڕایت بۆ ئەوەی بگەیتە لام.

وەڵامی دایەوە: بەڵێ .

پێی ووت: دوای دابەزین لە فڕۆکەکە گەرماشینت دەست نەکەوتایە بەپێ دەهاتیت.

وەڵامی دایەوە: بەدڵنیاییەوە.

پێی ووت: بەسەر ئەم شاخەدا هەڵزنایت و نەشت دەزانی کە ڕوو لەکوێ دەکەیت.

وەڵامی دایەوە: بەڵێ.

پێی ووت: کاتێك کەسەرکەووتیت و هیچ شتێکت بەدەست نەهێنا، هەستت بەچی کرد؟

وەڵامی دایەوە: هەستم بە شکستێکی گەورە کرد.

پێی ووت: ڕێگەت بە شکست دا بەسەرتا زاڵ بێت؟

وەڵامی دایەوە: بە دڵنیاییەوە نەخێر.

پێی ووت: ئەی دواتر چیت کرد؟

پێی ووت: سەرەتا زۆر توڕە بووم، بەڵام بیرم کردەوە و ئارامم گرت، سەرلەنوێ دەستم کرد بەکارکردن، پارەم پاشەکەوت کرد و بڕیارم دا کەبەهەر بەهایەك بێت بت بینم.

پێی ووت: کاتێك کە هاتیت بۆ ئێرە و دووبارە بەبێ سوود گەڕایتەوە هەستت بەچی کرد؟

وەڵامی دایەوە: لەجاری یەکەم توڕەتر بووم، گەیشتمە ئاستێکی زۆر گران لەخەم و دڵتەنگی دا، ئەم حاڵەتەم تاماوەیەك بەردەوام بوو، بەڵام دووبارە شێلگیرانە گەڕامەوە بەرکار و نیەتم کرد کەبەهەر



Scanned with CamScanner

شێوەیەك بووە بتبینم، پارەم پاشەکەوت کرد، سەفەرم کرد بۆ لات، ئەو ئەگەرەم دانا بوو کەنەت بینم، هەرواش بوو نەم توانی بتبینم، بەلأم ئەم جارە دووبارە هەستم کرد دەروازەی ئومێد بە ڕوومدا دەکرێتەوە بەوەی کە زوودتر بێم بتبینیم، دوای ئەوەش کە هاتم بۆلات و بۆماوەی هەفتەیەك لەدەرەوە مامەوە، بەخۆمم ووت: هیچ گرنگ نی یە، من هەر دەتبینم، بەلأم من مرۆڤم، هەندێك جار هەستم بە نائومێدی دەکرد، بەکوڵ ئەگریام و چاوم دادەخست و لەوپەڕی دڵ تەنگی دا بووم، بەلأم ئەم جارە ڕووم لە یەزدان کرد و ووتم:

ئەی پەروەردگار، دواتر ئەم ئایەتەم بیر کەوتەوە ﴿ هەرگیز پاداشتی ئەوکەسە لەیاد ناکەین کە بە باشی کار دەکات﴾ "سورەتی کهف ئایەتی ٣٠ ". منیش کاری باشم کرد و هاتم بۆ ئێرە، ئەمەویست ئەو کەسە ببینم، کاتێکیش کە هەستم بە دەستت کرد لەسەرشانم، هەستم بەشتێکی گرنگ کرد، ئەویش ئەوە بوو کە یەزدان زۆر لێمان نزیکە و وەلأمی پاڕانەوە کانمان دەداتەوە. کەسی دانا پێی ووت: سەرجەم ئەوشتەی کە باست کرد، ڕێگەی بالأ بوونە، تۆش هەروەك زۆر لە خەڵکی لەسەر ڕێگەی بالأ بوونیت و هەستی پێ ناکەیت دروست هەر وەك ئەوە کەسەی کەلە ناسودەیی دا دەژی و لەگەڵ ئەوەشدا تەمەنی خۆی لە پێناو گەڕان بەدوای ئاسوودەیی دا دائەنێت ، هەر وەك ئەو کەسەی کە بەسەرکەوتوویی دەژی و لەلایەکی ترەوە بە دوای سەرکەوتن دا دەگەڕێت. دواتر بەردەوام بوو: کوڕەکەم.... کۆی ئەو

شتانەی کە پێت ووتم بریتی بوو لە ڕێگای باڵا بوون، بۆ ئەوەی لە وێستگەیەکەوە بگەیتە وێستگەیەکی تر و لەوێوە بیت بە مرۆڤی باڵا، لەبەر سوور بوون و پابەند بوونت من یارمەتیت دەدەم بۆ ئەوەی ببیت بە مرۆڤی باڵا، باپێکەوە دەست بەکار بین تا ئەگەینە سەر ئەو ڕێگەیە.

کەسی دانا لە چاوی گەنجەکەی ڕوانی ووتی: ڕێگەی باڵا بوون بە هۆکارەکان دەست پێ دەکات.... دواتر پرسیاری لێ کرد: چیت دەوێت؟!

گەنجەکە وەڵامی دایەوە: ئەمەوێت ببمە مرۆڤی باڵا ...

پێی ووت: ئەمە پەیامێکی گشتی یە، خەڵکی هەموو دەیانەوێت مرۆڤی باڵا بن بەڵام تۆ دوا ئەنجامت چی یە؟؟

وەڵامی دایەوە: دوا ئەنجام چی یە؟!

پێی ووت: دوا ئەنجام ، کۆتایی ڕێگاکەیە، ئێستا کۆتایی ئەو ڕێگەیە کامەیە کە لەسەری دەڕۆیت؟!

وەڵامی دایەوە: ببم بە مرۆڤی باڵا.

پێی ووت: من ئەم ووشەیەم پێشتر بیستووە، ئەگەر جارێکی دیکە دووبارەی بکەیتەوە بەجێت ئەهێڵم و ئەڕۆم، بەدیاری گراوی پێم بڵێ دوا ئەنجامت چی یە؟! ئەتەوێت ببیت بەچی؟!

وەڵامی دایەوە: بڕیارم داوە کە کۆمپانیایەك دابمەزرێنم کە تایبەت بێت بە خۆم.

پێی ووت: لە چ بوارێك دا ئەم کۆمپانیایە کار دەکات؟!



Scanned with CamScanner

وەڵامی دایەوە: لەبواری ئەلەکترۆنی دا.

پێی ووت: بۆچی؟

وەڵامی دایەوە: لەبەر ئەوەی جیهان لە بواری زانست دا پێش دەکەوێت و منیش ئەمەوێت بەشێك بم لەو جیهانە پێش کەوتووە و ببمە مرۆڤێکی باڵا.....

پێی ووت: باشە... ئەمە دوا ئەنجامە، بەڵام دوای چەند ساڵ ئەتەوێت بگەیت بەم دوا ئەنجامە.

وەڵامی دایەوە: دوای پێنج ساڵ.

پێی ووت: باشە لە ماوەی ئەم پێنج ساڵە دا چی ئەکەیت لەبەر ئەوەی لەو ماوەیەدا تۆ ئەبێت گەیشتبێتیت بە ئامانجەکەت.

لێرەدا کەسی دانا دەستی کرد بە باسکردنی جیاوازی نێوان دوا ئەنجام و ئامانج و ئامانجی بەردەوام لە کات دا، پێی ووت: باش گوێم لێ بگرە ... جیاوازی چی یە لە نێوان دوا ئەنجام و ئامانج دا، زۆر لە خەڵکی پێیان وایە کە دوا ئەنجام ئامانجە، بەڵام ئامانج بە شێکە لە دوا ئەنجام، دوا ئەنجام کۆتایی ڕێگاکەیە، زۆربەی خەڵکی وا دەڕوانننە دوا ئەنجام وەك ئەوەی کە ئامانج بێت. بەڵام دواتر دووچاری نائومێدی دەبن، لەبەر ئەوەی بەراورد ئەکەن لەنێوان ئەوەی کەلە ئێستا دا هەیە و ئەوەی لە داهاتوودا دەبێت ببێت، بۆیە نائومێد دەبن لەبەر ئەوەی ئەو ڕێگەیە دور و درێژە. بەڵام ئەوە ئەو ڕێگە دروستەیە کەدەمەوێت بیگریتە بەر.

دوا ئەنجام بریتی یە لە کۆتایی ئامانج... واتە بیت بەخاوەنی ئەو کۆمپانیایەی کە دەتەوێت، بەڵام ئامانج پلەی یەکەمە پلەی یەکەمیش دەتگەیەنێت بە پلەی دووەم.

ڕێگای باڵا بوون بە زانینی دوا ئەنجام دەست پێ دەکات، دواتر دوا ئەنجامەکەت بەش دەکەیت بەسەر ئامانجەکانت دا بەشێوەیەك کە هەر ئامانجێك بتبات بەرەو ئامانجێکی دواتر، هەر ئامانجێکیش بتبات بەرو دوا ئەنجام. بۆ جارێکی تر دەپرسم، دوا ئەنجامت چی یە؟

پێی ووت: دوا ئەنجامم ئەوەیە کە ببم بە خاوەنی یەکێك لە کۆمپانیاکانی دکتۆر نیاب.

کەسی دانا ووتی: ئامانجی یەکەمت چی یە؟!

پێی ووت: خوێندنی هەر شتێك کە پەیوەندی بە کۆمپیوتەرەوە هەبێت...

کەسی دانا پرسی: ئامانجی دووەمت چی یە؟

وەڵامی دایەوە: زمان فێر بم.

کەسی دانا پرسی: بۆ زمان؟

وەڵامی دایەوە: لەبەر ئەوەی زمان یەکسانە بە مرۆڤ دواتر مرۆڤەکان لەیەکدی نزیك ئەکاتەوە؟

پێی ووت: لەم حاڵەتەدا تۆ دەبێت فێری هونەری پەیوەندی گرتن بیت. باشە تۆ ئێستا فێری ئەلکترۆنیات بوویت، دواتر چی ئەکەیت؟

وەڵامی دایەوە: فێری هونەری پەیوەندی گرتن ئەبم بەخەڵکی یەوە.



Scanned with CamScanner

پێی ووت: بۆچی؟

وەڵامی دایەوە: بۆئەوەی پەیوەندی بە خەڵکی یەوە بکەم و بزانم چۆن بە باشترین شێوە شتیان پێ بفرۆشم.

پێی ووت: ئەی دوای ئەوە؟

وەڵامی دایەوە: فێری هونەری بازاڕ دۆزینەوە ئەبم.

پێی ووت: بۆ؟

وەڵامی دایەوە: بۆئەوەی فێربم چۆن بەرهەمەکان بە خەڵکی بفرۆشم.

پێی ووت: ئەی دوای ئەوە؟

وەڵامی دایەوە: فێری فرۆشتن ئەبم.

پێی ووت: ئەی دوای ئەوە؟

وەڵامی دایەوە: فێری خزمەت کردنی مەعمیلەکانم ئەبم.

پێی ووت: بەکۆی ئەو کارە چی ئەڵێیت؟

وەڵامی دایەوە: گرنگی پی‌دان.

پێی ووت: واتە ئامانجی یەکەمی دوا ئەنجامت بریتی یە لەوەی کە هەموو شتێك لەبارەی ئەلکترۆنیاتەوە بزانیت؟!

وەڵامی دایەوە: بەڵێ.

پێی ووت: ئایا ئەم ئامانجە خزمەتی دوا ئەنجامت دەکات؟

وەڵامی دایەوە : بەڵێ

پێی ووت: ئەم ئامانجە بەکوێت ئەگەیەنێت؟!



Scanned with CamScanner

وەڵامی دایە: بەفێر بوونی زمان.

پێی ووت: ئایا ئەم کارە خزمەت بە دوا ئەنجامت دەکات؟

وەڵامی دایەوە : بەڵێ

بەم شێوەیە بۆمان دەردەکەوێت کە ئامانجی یەکەم خزمەتی ئامانجی دووەم دەکات، ئامانجی یەکەمیش خزمەتی دوا ئەنجام دەکات و سەرجەم ئامانجەکان ئەگەن بە دوا ئەنجام، هەنگاوەکانت بریتین لە پلەکان هەر پلەیەك دەتگەیەنێت بە پلەی دواتر، بەمەش دەوترێت ڕێگای باڵا بوون بەشێوەیەکی پێشکەوتووانە، ئەم پرۆسەیە پرۆسەیەکی گەشە سەندووی بەردەوامە. هەر شتێك دەتگەیەنێت بەوەی دواتری، هەموو شتێك خزمەت بە دوا ئەنجام دەکات، ئەمە ڕێگای باڵا بوونە، کەواتە لێرەوە دەست پێ بکە، کاتێك کە لێرەوە دەست پێ ئەکەیت نامەیەکم بۆ بنێرە بۆ ئەوەی دڵنیام بکەیت، منیش نامەیەکت بۆ دەنێرم بۆ ئەوەی پێت بڵێم کەوێستگەی دواتر کامەیە. گەنجەکە تا ئەو ساتە باوەڕی نەدەکرد کە کەوتۆتە سەر ڕێگای باڵا بوون. دوای ئەوەی گەڕایەوە بۆ شارەکەی خۆی، کاغەزو قەڵەمێکی گرت بەدەستەوە و دەستی کرد بە پلان دانان کەلە ئێستاوە تا ماوەی پێنج ساڵی دیکە دەتوانێت یەکەمین ئامانج بەدەست بهێنێت و دەتوانێت ببێت بە خاوەنی گەورەترین کۆمپانیا لە بورای ئەلەکترۆنیات دا، ئامانجی یەکەمم لە مرۆدا بریتی یە لە فێر بوون هەموو شتێك سەبارەت بە ئەلەکترۆنیات.



Scanned with CamScanner

گەنجە دەستی کرد بە فێر بوونی هەموو شتێك سەبارەت بە ئەلەکترۆنیات، دواتر دەستی کرد بە گەڕان، دەگەڕا بەدوای ژمارەی ئەو کۆمپانیایانەی کە کاری ئەلەکترۆناتیان دەکرد ... دەستی کرد بە سەردان کردن و پشکنینی ئەو کۆمپانیایانە، دواجار بڕیاری دا کەلەگەڵ یەکێکیان دا فێر بێت. هەر لەو ماوەیەدا چووە ناو ئینتەرنێتەوە و زیادتر دەگەڕاو پشکنینی دەکرد لەو بوارەدا، وورده وورده ئەو شایستەییەی بەدەست هێنا بۆ ئەوەی بتوانێت کە کۆمپانیا یەك دابمەزرێنێت، ئێستا ئەو خاوەن زانیاری و شارەزای یە، دواجار لە بواری ئەلەکترۆنیات دا بوو بە کەسێکی زۆر شارەزا.

دوای ئەوە دەستی کرد بە فێر بوونی زمانی بێگانە، ئومێدوار بوو لەبەر ئەوەی پرۆسەکە پێش کەوتنی بە خۆوە بینی و لە شوێنێکەوە دەیگەیاندە شوێنێکی دیکە، ئێستا دەیتوانی کار بە ئەنجام بگەیەنێت. مرۆڤیش کاتێك کە کارێك تەواو ئەکات هەست بە ووزەیەکی مەزن ئەکات لە ناخی دا و ئەیەوێت زیادتر و زیادتر ئەنجام بدات. ئەمە شتێکی گرنگە لە مرۆڤ دا، لەبەر ئەوەی مرۆڤ کاتێك کە کارێك ئەنجام دەدات ڕێز گرتنی بۆخۆی زیاد دەکات و وێنەی خۆی لە پێش چاوی خۆی باشتر دەبێت... دەرەنجام کاری زیادتر دەکات. گەنجەکە سەرەتا لەگەڵ ئەلەکترۆنیات دا دەستی پێ کرد، دواتر زمان، دواتر هونەری پەیوەندی کردن بۆ ئەوەی باشتر بێت لەگەڵ خۆی و ئەوانی دی دا، بۆی دەرکەوت کە گەیشتن بە هەر ئامانجێك ڕێگە خۆش ئەکات بۆ

گەیشتن بە ئامانجی دواتر. ئەوە فێر بوو کە چۆن خودی خۆی کۆنترۆڵ بکات، ئەم کارەش بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی کێشەکان بوو. گەنجەکە تێپەڕ بوونی خێرای کاتدا بەسەرجەمی ئەم کارانە هەڵسا، پێنج ساڵەکە تێ پەڕی، گەنجەکە پارەی پاشەکەوت کرد، کاری کردو تێ کۆشا، تاتوانی کۆمپانیایەك دابمەزرێنێت و بۆ کردنەوەی ئاهەنگێکی گەورەی گێڕا، خەڵکی زۆری بانگهێشت کرد، بەڵام دوای تێ پەڕ بوونی دوومانگ کۆمپانیاکە شکستێکی گەورەی هێنا، بێ گومان هیچ کات پێش بینی ئەم شکستەی نەدەکرد، هەر خۆی بوو کە هەستا بە ئەنجام دانی گشت کارەکان و پلانی بۆ دارێژاو ئەنجامی دا، چاوەڕوانی کردو پابەند بوو بەکارەکەیەوە و سوور بوو، شارەزایی هەبوو، هەموو شتێکی پێویستی هەبوو، باشە هۆی ئەم شکستە گەورەیە چی بوو؟ دەست بەجێ بلیتی فەراهەم کرد و گەڕایەوە بۆلای کەسی دانا، پێشهاتەکانی گەشتەکانی سەرەتا وەك خۆیان دووبارە بوونەوە، هەر کە ئەگەیشتە ئەوێ سەر لەنوێ ئەگەڕایەوە، ئەم پرۆسەیەی چوار جار دووبارە کردەوە تا ئەو جێگەیەی کە دواجار توانی کەسی دانا ببینێت.

کەسی دانا پرسی: چی ڕووی داوە؟

گەنجەکە وەڵامی دایەوە: ئەوەی کە پێت وتم سوودی پێ نەگەیاندم.

کەسی دانا پرسی: چیت کرد؟!



Scanned with CamScanner

وەڵامی دایەوە؛ دوا ئەنجامم دیاری کرد، پلانم بۆ ئامانجەکانم دانا، جێ بەجێم کرد، سور بووم و پابەند بووم، سەرجەم ئەو ئامانجانەم پێکا کە دەم وویست، کۆمپانیا کەم کردەوە، ئاهەنگێکی گەورەم سازکرد لەکاتی کردنەوەی پرۆژەکەم دا، زۆر بەباشی هەڵسام بە کاری بازاڕ سازی ، پارەیەکی زۆرم لە ڕیکلام کردن دا خەرج کرد، کەسانێکم لە بوارای پەیوەندی گشتی دا دامەزراند، هەر شتێك کە پێویست بوو ئەنجامم دا بۆ سەرکەوتنم، سەرجەم هۆکارەکانم لەبەر چاوگرت. سەرباری ئەوە سەرکەوتوو نەبووم، هۆکاری چی یە؟!

کەسی دانا بەزەردەخەنەوە لێی ڕوانی و پێی ووت؛ کوڕی گەنج ... تۆ هەموو هۆکارەکانت لەبەر چاو گرت.... بە ئەندازەیەك کە عاشقی بوویت، بەڵام نەگەڕایتەوە سەر دروستکەری هۆکارەکان، بۆیە لەناو هۆکارەکاندا کەوتیت. گەنجەکە سەیرێکی کردوو ووتی : مەبەستت چی یە؟! تۆ ئەم قسەیەت پێشتر بە من نەوتبوو.

کەسی دانا ووتی: یەکەم جار کەهاتیتە لام، ڕستەیەکەت بە من ووت، من زۆر خۆشم لێی هات، ئەویش بریتی بوو لەوەی کە یەزدان وەڵامی پاڕانەوەکانمان دەداتەوە، تۆ لە خوا پاڕایتەوە و منت دۆزیەوە، ئەوکاتەی کە ڕاستەوخۆ دەستم خستە سەرشانت، بەڵام کاتێك کە گەڕایتەوە هەمان هەڵەی ئەو کەسانەت دووبارە کردەوە کە پێیان وایە تەنها هۆکارەکان بە کەڵکیان دێت و دروستکەری هۆکارەکانیان لە بیریان کرد، تەنها دروستکەری هۆکارەکانە کەبە کەڵکمان دێت لەبەر



Scanned with CamScanner

ئەوە زۆر پێویستە کەئەم ئایەتەت لە یاد بێت﴿ئەگەر نیەتت هێنا پشت بە پەروەردگار ببەستە و لەبەر ئەوەی پەروەردگار ئەو کەسانەی خۆش دەوێت کە پشتی پی دەبەستن﴾ "سورە العمران الایە ١٥٩". کوڕە گەنجەکە سەیری کەسی دانای کردو گریا ووتی: نازانم چۆن دوای لێ بوردنت لێ بکەم....

کەسی دانا: داوای لێ بوردن مەکە، خواوەند لێت نزیکە و ئەتبیستێت، خواوەندی تۆی لێرە دانا بۆئەوەی یەکەمین کەس بیت کە دەگەڕێیتەوە بۆلای . هەمیشە ئەم ئایەتەت لەیاد بێت ﴿هەرگیز پاداشتی ئەوکەسە ون نابێت کە کردەوەیەکی باش دەکات﴾ "سورە الکهف الایە ٣٠".

گەنجەکە پێی ووت: من زۆر داوای لێ بوردن ئەکەم...هەڵەم کرد...

کەسی دانا پێی ووت: بە پێچەوانەوە، تۆ شکستت نەهێنا، بەڵام شتێکی زۆر گرنگت کەم بوو، ئەویش بریتی بوو لە بنەماکانی سەرکەوتن.

گەنجەکە پێی ووت: بنەماکانی سەرکەوتن چی یە؟!

کەسەی دانا وەڵامی دایەوە: تۆش کەووتیتە داوی هەمان ئەو هەڵەیەی کە کەسانی دیکەش دەکەونە ناوی، ڕێگەی باڵابوونت گرتە بەر بەبێ ئەوەی بزانیت بنەماکانی ئەو ڕێگەیە چی یە، ڕێگەی باڵابوونت لەمن داواکرد، منیش لەوبارەیەوە ڕێنمایم کردیت تۆ ئەتەوێت ببیتە مرۆڤی باڵا، پرسیارم لێ کردیت چیت دەوێت؟ ووتت:

ببمە خاوەنی کۆمپانیایەك لە بوراى ئەلکترۆنیاتدا، ئەمە رێگاى بالا بوون نی یە. بەڵکو ئەمە رێگەى ئەو ئامانجەیە کەبە بەدەست هێنانی کۆتایی پێ دێت، تۆ دەستت پێ کرد، هەموو شتێك سەبارەت بە ئەلکترۆنیات فێر بوویت، فێرى زمان بوویت، فێرى هونەرى پەیوەندى گرتن بوویت دواتر ئامانجەکەت بەدەست هێنا و گەیشتیت بە دوا ئەنجام، ئایائەوکاتەى کە کۆمپانیاکەت کردەوە زاڵ بوویت بەسەرخۆت دا؟!

وەڵامی دایەوە: نەخێر .

پێی ووت: پەیوەندیت بەباشی لەگەڵ خۆت دا بەستبوو .

وەڵامی دایەوە: نەخێر .

پێی ووت: ئەو زمانەى کە فێرى بوویت، چۆن قسەت پێ ئەکرد لەگەڵ خۆت دا.

وەڵامی دایەوە: بەشێوەیکی نێگەتیڤانە .

پێی ووت: ئەو شتەى کە فێرى بوویت لەدژى خۆت بەکارت هێناوە، لەبەر ئەوەى ئەو کەسەى عاشقی هۆکارەکان بێت دەکەوێت. تۆ بەو هۆکارانەوە رووت لە دنیاى دەرەوە کردوەو کینەت لە دڵ گرتووە، دەستت کردووە بە بەراود کردن و لۆمە کردن و گومان کردن، ئەو فەرموودەیەى خواوەندت فەرامۆش دەکەیت کە دەفەرموێت﴿خواوەند هیچ شتێك لە میللەتێکا ناگۆرێت تا خۆیان گۆران لە خۆیاندا دروست نەکەن﴾" سورەتی رعد ئایەتی ١١".

تۆ لەگەڵ ئەوەشدا کە گشت هۆکارەکانت لەبەرچاو گرتبوو، بەڵام ئەبینیت کەئێمە بەم شێوەیە خۆمان بەدەستی خۆمان لەناو دەبەین. بە گشتی خەڵکی هەر هەمان هەڵە دووبارە ئەکەنەوە و هۆکارەکان لەبەر چاو ئەگرن، بەڵام دروستکەری هۆکارەکان فەرامۆش ئەکەن.

کەواتە هەستە کوڕەکەم، با سەر لەنوێ دەست پێ بکەینەوە، لات ڕوون بێت کە تۆ هێشتا بە تەواوەتی دەستت پێ نەکردووە، تۆ تەنها هۆکارەکانت لەبەرچاو گرتووە، هۆکارەکان ئێستاش بونیان هەیە، بەڵام تۆ شتێکی زۆر گرنگت فەرامۆش کردووە ئەویش ئەوەیە کە تۆ بۆ ئەوەی سەرکەوتوو بیت ئەبێت بە ناو شکستا گوزەر بکەیت، لەبەر ئەوەی شکست سەرەتای سەرکەوتنە، کێشەکان سەرەتان بۆ حەوانەوە، هەر وەك چۆن شەو سەرەتای ڕۆژە، بەم پێ یە هەرگیز هەست بە جوانی و گەورەیی شتێك ناکەیت تا پێچەوانەکەی نەچێژیت.

لێرەدا گەنجەکە پرسی: کەواتە من چی بکەم؟! چۆن دەست پێ بکەم بۆکوێ بچم؟! من ئێستا هۆکارەکان ئەزانم، ئەشزانم کە چۆن لەبەر چاویان بگرم، ئەشزانم چۆن پلان دابنێم و جێ بەجێ یان بکەم و دوای ئامانج دیاری بکەوم، ئەزانم لە چ کاتێکا ئەبێت نەرم بم و لە چ کاتێکا پێدابگرم، ئێستا پەی بەگشت هۆکارەکان ئەبەم ... باشە ئێستا ئەبێت چی بکەم؟!

کەسی دانا زەردەخەنەیەکی کردو و وتی: دواجار پرسیاری دروستت کرد، ئەمە یەکەمین هەنگاوی ڕێگەی باڵا بوونە و لە بنەماکانی ڕێگای باڵابوونە، یەکەمین بنەمای ڕێگەی باڵابوونیش پەیوەندی کردنە بە خواوەندەوە.

# پەیوەندی کردن بە خواوەندەوە

پەیوەندی کردن بەخواوەندەوە: چەند مەزنە ئەو ئارامی و دڵ سکانییەی کەلە پەیوەندی کردن بە خواوەندەوە دێتە ئاراوە، لەو کاتانەدا تۆ ئازاد و سەربەستیت، بەندەی هیچ جۆرە بوونەوەرێك نیت جگە لە خواوەند نەبێت.

گەر مرۆڤ لەهەر جوڵەیەك لە جوڵەکانی دا پەیوەندی بکات بەخواوەندەوە و پابەند بێت بە فەرمانەکانی یەوە، دەتوانێت ببێتە پێشەنگ لەسەر ئاستی خێزان و کۆمەڵگادا.

لەم کاتەدایە کە مرۆڤ تامی ئەم خۆشی یە بێ وێنەیە ئەکات کە ئەویش خۆشی باوەڕە، هەروەك پەیامبەر دەفەرموێت ﴿هەر کەسێك کە باوەڕ بهێنێت بە پەروەردگار وەك خواوەند و ئیسلام وەك ئایین و بە محمد وەك پەیامبەر، تامی باوەڕ دەکات﴾ "بەڕیوایەتی موسلم".

بۆ پەیوەندی کردن بە پەروەردگارەوە پێویستمان بە چەند بنەمایەك هەیە، یەکەمین بنەماش بریتی لە لێبوردەیی :

- لێبوردەیی:

بەو مانایەی کە لە گشت خەڵکی ببوریت، ئەگەر نا لە سینەت دا تورەیی و کینەو گومان هەڵدەگریت. کاتێك بەخۆت دەزانیت کەبە بارگەیەکی نێگەتیڤ بارگاوی بوویت بەبێ ئەوەی هیچ پێویستی یەکت پێی هەبێت.

گەنجەکە پرسی: چۆن ببورم؟! باوکم بەبێ هیچ هۆیەك لێی ئەدام، دایکیشم بەبەردەوامی شەڕی لەگەڵ دەکردم و بەجێی ئەهێشتم، براکانم گاڵتەیان پێ دەکردم، من چۆن بیانبوورم؟!

کەسی دانا وتی: کاتێك کە ئەم قسانە ئەکەیت هەست بەچی دەکەیت؟

وەڵامی دایەوە: هەست بە ووزەیەکی زۆر نێگەتیڤ ئەکەم...

پێی ووت: ئایا ئەم ڕێگای باڵا بوونە ؟!

گەنجەکە بێ دەنگ بوو دواتر ووتی: ئایا دوای ئەو هەڵوێستەیان لەگەڵ مندا، ئەبێت بیان بوورم؟!

کەسی دانا: کوڕەکەم باش بزانە کە لێبوردن لە نیشانەی کەسە بەهێزەکانە، لێ بووردن تەنها بۆ خواوەندە و بۆ خەڵکی نی یە، ئەمە لە نێوان تۆ و خواوەند دایە، تۆ نوێژ ئەکەیت و داوا لە خواوەند ئەکەیت کە بت بورێت، تۆ هەڵەو گوناهی زۆر ئەکەیت، هەمووومان هەڵە دەکەین لەگەڵ ئەوەشدا داوا لە خواوەند دەکەین کە بمان بورێت.

ئەنەس کوڕی مالك لە زمانی پەیامبەرەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێت﴿ کەی کوڕی ئادەم ... گەر تۆ بانگم لێ بکەیت و لێم بپاڕێیتەوە

ئەتبوورم لەسەرجەم ئەوکارانەی کە کردووتەوە و گرنگی نادەم ...
ئەی کوڕی ئادەم گەر گوناهەکانت بگەنە عەرشی ئاسمان و دواتر داوای
بەخشینت کرد، ئەتبورم و گرنگی نادەم... گەر بە ئەندازەی گۆی زەوی
گوناه بکەیت و دواتر چاوت بە من کەوت، هاوبەشم بۆ پەیدامەکە و
منیش هەر بەو ئەندازەیە ئەتبەخشم﴾.

ئێستاش ئەی کوڕی گەنج... ئەتەوێت ببوریت یاخود نا؟

گەنجە کە سەیرێکی کردو پێی ووت: بڕیارم دا بیانبورم...

کەسی دانا: چاوەکانت لێك نێ و هەناسەیەکی قووڵ هەڵبمژە و با
هەناسەدانەوەکەت لە هەناسە هەڵمژینەکەت قووڵتر بێت. لێرەوە
دەچیتە قۆناغی خاو بوونەوە.... دواتر ووتی: ئێستا هەناسەیەکی
قووڵ هەڵبمژە، دواتر ڕێگەی بدە بەهەواکە بەهێواشی لەسینەت بێتە
دەرەوە تا ئەو جێگەیەی کە هەست بە خاوبوونەوە ئەکەیت لە تەواوی
بەشەکانی جەستەت دا... ئێستا یادەوەریت ببەرەوە بۆ دواوە بیر لە
دایکت و باوکت بکەرەوە هەر ئێستا بیان بووره....

گەنجەکە دەستی کرد بەگریان.

کەسی دانا پێی ووت: بۆچی ئەگریت؟!

گەنجەکە ووتی: لەبەر ئەوەی هەستم کرد کە من ستەمکار بووم
لەگەڵیاندا، هەروەها من هۆکار بووم بۆ دروست بوونی کێشەی گەورە...

پێی ووت: ئێستا بچۆرە لای براو خوشکەکانت و بیان بووره....

ووتی : ئێستا ئەوانیشم بووری.



Scanned with CamScanner

پێی ووت: ئەزانیت بۆچی ئەوانت بووری؟! لەبەر ئەوەی دەستت کردووە بە بوورین و هەستت بە جوانی بوورین کردووە، کاتێکیش کە گریایت هەستت کرد کە ووزەیەکی نێگەتیڤ لە جەستەت دێتە دەرەوە و ووزەیەکی ڕۆحانی هاتە جێگەکەی، بۆیە کاری لێبووردن ئاسانتر و ئاسانتر بووە بە لاتەوە، ئێستا تەواوی خەڵکی بوورە، ووزەیەك بکەرەوە، دواتر بگەڕێرەوە بۆ ئێرە. گەنجەکە ئەوەی کرد، گەڕایەوەو زەردەخەنەیەك لەسەر دەم و چاوی بوو چاوەکانیشی پڕ بوو لە فرمێسك.

گەنجەکە ووتی: من پێشتر هەستم بە جوانی بەخشین نەکردبوو، لەبەر ئەوەی لە کاتێك لە کاتەکاندا من زۆر تووڕە بووم... تەنها لە تووڕەیی وورد ئەبوومەوە....

کەیب دانا: ئەمە دەروازەیەکە لە دەروازەکانی ئەهریمەن، لەبەر ئەوەی لەوکاتەدا دێتە ژوورەوەو کە ئەبینێت تۆ تووڕەیت، کێشەکە لە ناخت دا گەورە دەکات، پێت ئەڵێت: ئەو وای لەگەڵ کردی.... ئەو بەم کارە دەیەوێت تۆ لە پەروەردگار دووربخاتەوە، ئەهریمەن لە باوەڕ هێنان و خۆشویستنی پەروەردگار توورت دەخاتەوە، ئەمەیە کاری ئەهریمەن، دەروازەیەکی دۆزیوەتەوە بۆ ئەوەی لێوەی بێتە ژوورەوە. تۆ لەسەر باڵا بوونی، ئەم ووزەیە لەگەڵ خۆت هەڵدەگری و ئەم بارەش قوورسە، لەبەر ئەوە پێویستە کە پەیوەندی بکەیت بە خواوەندەوە،



Scanned with CamScanner

ئەمەش یەکەمین بنەمای ڕێگای باڵا بوونە ... لێبووردەیی تەواوەتی، تۆ ئێستا دەستت پێ کردووە...

گەنجەکە ووتی : ئەی دوای ئەوە؟

کەسی دانا ووتی: خۆشویستنی پەروەردگار.

خۆشویستن لەڕێی خواوەند دا:

تۆ پێویستە لەڕێی خواوەند و بۆ خواوەند خۆشەویستی بکەیت ...

پێی ووت: چی بکەم؟

کەسی دانا ووتی: پێویستە تۆ لەڕێی خواوەند دا خەڵکت خۆش بوویت، کاتێك کە بەکەسێك دەڵێیت کە تۆم لەڕێی خواوەند دا خۆشت دەوێت، بزانە ئەم ووتەیە چەند جوانە، خواوەندیش ئەو کەسانەی کەلەناو ئەودا خۆشەویستی دەکەن پەیمانی خۆشویستنیان ئەداتێ. لە ئەبی ئدریس ئەلخولانی دەگێڕنەوە کە دەڵێت ﴿چوومە ناو مزگەوتی دیمەشقەوە لەو کاتەدا گەنجێکی چوارشانە هاتە ناو مزگەوتەکەوە، هەر کەسێك کێشەیەکی هەبووایە بۆ چوونی ئەوی وەردەگرت و قسەی ئەویان بە نمونە دەهێنایەوە. پرسیارم کرد کە کێ یە؟ ووتیان مەعاز بن جەبەلە، کە کاتی نوێژی نیوەڕۆ هات مەعاز پێش من کەوت لە نوێژ کردن دا، چاوەڕوانم کرد تا لە نوێژەکەی بۆوە، دواتر ڕووم تێ کرد و سلاّوم لێ کرد و پێم ووت: سوێند بێت بە خواوەند کە من تۆم لە ڕێی خواوەند دا خۆش دەوێت.



Scanned with CamScanner

ووتی: وەڵا؟

ووتم: خواوەند

ووتی: خۆشحاڵ بە لەبەر ئەوەی گوێم لێ بوو کە پەیامبەر دەی فەرموو﴿ خوا دەفەرموێت: خۆشەویستی خۆم دەبەخشم بەو کەسانەی کە لە مندا یەکتریان خۆش دەوێت و دادەنیشن و سەردانی یەکدی دەکەن و قسەی خۆش دەکەن﴾.

کاتێک یەکێک بە یەکێکی تر دەڵێت کەزیاد لە هەر کەسێکی دیکە خۆشی دەوێت، یاخود کاتێک کە ژنێک بە مێردەکەی دەڵێت کە زیاد لە هەر شتێکی دیکە خۆشی دەوێت.... یاخود مێردێک بە ژنەکەی هەمان شتی سەرەوە دەڵێت، ئەوا ئەو کەسانە بەو کردەوەیان خواوەندیان لە یاد کردووە. دەرەنجام خواوەندیش دەست بەرداریان دەبێت. کەلێن لە نێوانیاندا دروست دەبێت ژیانیان ناخۆش دەبێت لەبەرئەوەی خۆشەویستی دەبێت لە ڕێی خواوەند و بۆ خواوەند بێت، پێویستە مێرد بە ژنەکەی بڵێت: من تۆم خۆش دەوێت لەڕێی خواوەند و بۆ خواوەند. هەروەها دەبێت ژن بە مێردەکەی بڵێت: من تۆم خۆش دەوێت لەڕێی خواوەند و بۆ خواوەند، خواوەند تۆی بەخشی بەمن، منیش سوپاسی خواوەند ئەکەم بۆ ئەم نیعمەتە گەورەیەی کە پێمی بەخشیوە. دواتر کەسی دانا ئاورێکی لە گەنجەکە دایەوە و ووتی: ئەمەیە خۆشەویستی ڕاستەقینە ئەی کوڕی گەنج.



Scanned with CamScanner

گەنجەکە سەیرێکی کەسی داناى کردوو ووتی: بەڕاست ... من بەتۆم نەوتووە کە لەڕێی خواوەند و بۆ خواوەند تۆم خۆش دەوێت.

کەسی دانا پێکەنی ووتی: من تۆم لە ڕێی خواوەند دا خۆش دەوێت.

لێرەدا گەنجەکە هەستی بە خۆشەویستی کرد، بە خۆشەویستی ڕاستەقینە، هەستی بە جوانی خۆشەویستی لەڕێی خواوەندا کرد.

لەهەر بەشێکی جەستەی دا هەستی بە گەرما کرد، هەستی بە ئارامی یەکی ناوەکی و دەرەکی کرد، هەستی بە ئاسایش دەکرد لەناخی دا، هەستی بە خۆشەویستی یەکی ڕاستەقینە دەکرد، خۆشەویستی خواوەند، سەیرێکی کەسی داناى کردو پێی ووت: هەر چەندە من سوپاست بکەم هێشتا ناتوانم قەرەبووی ئەو هەموو زانیاری یە بکەمەوە کە ئەمرۆ لێرە فێربووم.

کەسی دانا: پێویستە ئەم ووزەیە تەرخان بکەیت بۆ خواوەند لەبەر ئەوی خواوەند منی کردووە بە هۆکارێك کە بۆ گەیشتنی تۆ بە ڕێگای بالا بوون، لە ڕاستی دا تۆ دەستت کردووە بەو ڕێگەیە. ئەوەت لەیاد بێت کوڕی گەنج کە هەنگاوی یەکەم پەیوەندی کردنە بە خواوەندەوە.

گەنجەکە بەخێرایی وەلامی دایەوە: یەکەمین شت کە من فێری بووم وام زانی لێ بووردەیی یە .

کەسی دانا پێی ووت: دوای ئەوە؟ خۆشەویستی لەڕێی خواوەند و بۆ خواوەند.

ووتی : ئەی دوای ئەوە؟



Scanned with CamScanner

وەڵامی دایەوە: بەخشن....

## بەخشین

سێ‌هەمین بنەما بریتی یە لە بەخشینی بێ مەرج، دەست بکە بە بەخشین بەبێ مەرج، نیگەران مەبە و مەڵێ من ئەبەخشم بە فلان کەس و فیسار کەس و کەسیش هیچ بەمن نابەخشێت، یاخود: من ئەبەخشم بە هاوڕێ کانم کەس هیچ بەمن نابەخشێت، یاخود من ئەبەخشم بە هاوسێ کەم بەلام ئەو هیچ بەمن نابەخشێت، یاخود ئەبەخشم بەخێزانەکەم بەلام کەس هیچ بەمن نابەخشێت .... هەرکات تۆ ببەخشیت خواوەند لێت وەردەگرێت، گەر گلەیش بکەیت ئەو وەرگرتنەی خواوەند ئەپچڕێت، خواوەند لە ڕێگەی دیکەوە ئەبەخشێت. هەرگیز هەست بە خۆشی بەخشین ناکەیت گەر گلەی ئەوە بکەیت کەئەبەخشیت و هیچ بەدەستت ناگات، ئەمە سێ هەمین بنەمایە لە بنەماکانی پەیوەندی کردن بە خواوەندەوە، واتە بەخشین بە خواوەند نەوەك بە مرۆڤ. ئەوەش بزانە کە خواوەند تۆی کردوە بە سەرچاوەیەك .لەسەرچاوەکانی بەخشین، ئەمەش مانای ئەوەیە کە خواوەند تۆی کردووە بە کەسێکی دروست کار و چاکەخواز، ئەوەت لەیادبێت کە پەروەردگار، خەسڵەتێکی مەزنی پێ بەخشیوویت، پەروەردگار ئەوکەسانەی خۆشەئەوێت کە چاکە دەکەن.



Scanned with CamScanner

لێرەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە سێ بنەمای سەرەکی هەیە بۆ پەیوەندی کردن بە خواوەندەوە، ئەو سێ بنەمایەش بریتی بەلە: لێبووردەیی پڕاوپڕ، خۆشویستن لە ڕێی خواوەند دا، بەخشینی بێ مەرج.

لێرەدا گەنجەکە لە چاوی کەسی دانا وورد بۆوە و ووتی: ئەم ووتانە زۆر جوانن، من ئێستا هەست بە چێژی ئەم ووتانە ئەکەم، هەست بە جوانی ئەکەم، هەست بە ووزەیەك ئەکەم کە زیادتر لە خواوەندم نزیك ئەکاتەوە، ئێستا هەست بە ڕێگای باڵا بوون ئەکەم، ئەمە ڕێگای باڵا بوونە.

کەسی دانا بە زەردەخەنەیەکەوە لێی ڕوانی و دواتر دەستی خستە سەرشانی و ووتی: بەڵام هێشتا تەواو نەبووین. گەنجەکە پێی ووت : من ئێستا مرۆڤی باڵام...

کەسی دانا پێی ووت: نەخێر.

گەنجەکە ووتی: دوای بەخشینی پڕاو پڕ و خۆشویستن لەڕێی پەروەردگا و بەخشین بەبێ مەرج چ شتێکی دیکە ماوە؟

کەسی دانا وەڵامی دایەوە: باوەڕهێنان بە خواوەند.

## باوەڕهێنان بە خواوەند

لێرەدا گەنجەکە بە کەسی دانای ووت: من باوەڕم بە خواوەند هەیە....



Scanned with CamScanner

کەسی دانا پێی ووت: لەیادت بێت کە تۆ باوەڕداری، لە نیشانەکانی باوەڕیش ئەوەیە کە تۆ هەست بە خۆشی ئەو باوەڕ هێنانە بکەیت، لەو هەستە خۆشەشەوە ئاگات لە خۆت و تەندروستی خۆت و پارە و ناموسی خەڵکی بێت، لەبەر ئەوەی کەسی باوەڕدار، دزی لە خەڵك ناکات، درۆ ناکات، ناپاکی ناکات، کەسی باوەڕدار خاوەن ڕەوشێکی جوانە، پەیوەندی کردن بە خواوەندەوە وات لێ ئەکات کە باوەڕ بهێنیت، ئەم باوەڕەش زیادتر لە خواوەندت نزیك ئەکاتەوە، کەسی باوەڕدار پارێزەری پارە و نهێنی خەڵکی یە.... لێرەدا سەیری چاوی گەنجەکەی کردوو ووتی: ئێستا پێم بڵێ.... ئایا تۆ ئێستا باوەڕداری؟

گەنجەکە ووتی: من باوەڕدارم بەڵام نەك بەو شێوەیەی کە باسی لێ وە ئەکەیت، ڕەنگە کەسێك هەبێت کە باوەڕی بە خواوەند هەبێت و لە هەمان کاتیش دا دزی بکات لە خەڵکی، ئەوکەسە نوێژ ئەکات و بەڕۆژوش ئەبێت، تۆشتێکی زۆر گرنگت فێر کردم، ڕەنگە کەسێك هەبێت بەشێوەیکی ڕووکەشانە بەشێوەیەکی باش لەگەڵ خەڵکی دا مامەڵە بکات و نوێژ بکات و بەڕۆژوش بێت، بەڵام هەر ئەوکەسە دزی لە خەڵکی دەکات و ناپاکی دەکات، ئەمەش سیمایەکە لە سیماکانی دووڕووی. پەروەردگار خۆی هەڵدەسێت بە دابەش کردنی ڕزق و ڕۆزی، هەر ئەوە کە لە گشت شتێك ئەمان بەخشێت، بەڵام لە مافی خەڵکی دا پێویستە کە داوای بەخشین بکەین لە خاوەنی حەق، گەر ویستت بکەیت بە ڕێگای باڵا بوون و بگەیتە سەر ڕێگەی خواوەند پێویستە کە



Scanned with CamScanner

لەحەق نزیك بیتەوە، خواوەند بە ڕەحمترین و بەخشندەترینە، ئەو هەرگیز لە زڵم زۆر ڕازی نابێت، پەیامبەر دەفەرموێ﴿خواوەند لەیەکێك لەئایەتەکاندا دەفەرموێت: ئەی میللەتەکەم من ستەمم لە خۆم قەدەغە کردوووە و لەناو ئێوەشدا بە گوناهم کردووە. کەواتە ستەم کاری مەکەن﴾ "بە ڕیوایەتی موسلم".

تالەسەر ڕێگەی باڵا بوون بیت، ئەبێت مافی خەڵکی بدەیت، لە خۆشەویستی خواوەندیش دا، دەبێت نهێنی خەڵکی بپارێزیت و دوور کەویتەوە لە باس کردنی ئەم و ئەو، بە یاری یەزدان لە وێستگەی داهاتوودا، باس لەوە دەکەین. ئێمە هێشتا لەسەر باسی چۆنیەتی پەیوەندی کردنین بە خواوەندەوە. لەسەر باسی لێبووردنی پڕاوپڕ و خۆشویستن لە ڕێی خواوەند و بۆ خواوەند و بەخشینی بی مەرج و باوەڕ هێنان بە خواوەند. باوەڕهێنان بە خواوەند دەتگەیەنێت بە شتێکی گرنگ لە پەیوەندی کردنتدا بە خواوەندەوە....

گەنجەکە سەیرێکی کردوو ووتی: چی یە ئەوشتە؟ چونکە من ئێستا هەست بە خۆشی یەك ئەکەم کە پێشتر هەستم پێ نەکردووە، هۆی چی یە من ئێستا هەست بەو خۆشی یە ئەکەم؟ من هەستم کرد کە ئەمە ڕێگای باڵا بوون بێت.

کەسی دانا پێی ووت: تۆش - هەروەك زۆربەی خەڵکی - پشتت بەهۆکارەکان دەبەست بە بێ ئەوەی پەی بەوە بەریت کە بنەمای ڕاستەقینەی سەرکەوتن خواوەندە. من جارێکی تریش بۆت دووبارە

نەکەمەوە، بۆ ئەوەی هەمیشە لە یادت بێت و لە بێنە و بەرەی ژیاندا لە یادی نەکەیت، لەگەڵ مندا دووبارەی بکەرەوە: یەکەمین شت چی یە؟

وەڵامی دایەوە: لێ بووردن

ووتی ئەی دوای ئەو ؟

وەڵامی دایەوە: خۆشویستن لە ڕێی خواوەند و بۆ خواوەند.

پێی ووت: ئەی دوای ئەو؟

ووتی: بەخشینی بێ مەرج.

پێی ووت: واتە گلەی لەوە نەکەیت کە بەخەڵکی دەبەخشیت و لێیان وەرناگریت....

دواتر پێی ووت: ئەی دوای ئەوە؟

ووتی: باوەڕهێنان بە خواوەند، هەر کەسێکیش لەگەڵمدا بێت ئاسایش و پارێزراو دەبێت، من ماڵ و موڵکی خەڵکی دەپارێزم ، نهێنیان دەپارێزم لەکاری بازرگانییەکەمدا بەردەوام دەبم هەر وەك چۆن پەیامبەرمان فێری کردووم کە بۆ خۆی کەسێکی ڕاست و دروست بووە. منیش بە یاری یەزدان دەبمە کەسێکی ڕاست و دروست....

پێی ووت: تۆ ئێستا لەسەر ڕێگەی دروستی باڵا بوونی، بۆ ئەوەی لەسەر ڕێگەی پەیوەست بوو بە خواوەندەوە بەردەوام بیت، تۆ دوای ئەوەی کە باوەڕدەهێنیت بەبێ ئەوەی خۆت پێ بزانیت دەگەیتە بنەمایەکی تر کەئەویش ملکەچی یە.

## گوێ ڕایەڵی:

لێرەدا گەنجەکە ووتی: من گوێ ڕایەڵی خواوەندم....

کەسی دانا ووتی: چۆن؟

وەڵامی دایەوە: نوێژ ئەکەم و ڕۆژوو ئەگرم و ئەو کارە ئەکەم کە خواوەند فەرمانی پێ کردووە.

کەسی دانا ووتی: بەڵام تۆ هەندێك جار درۆ ئەکەیت، قین لە کەسێك هەڵئەگریت و گومان دەکەیت، دەبێت ئەوە بزانیت کە گوێ ڕایەڵی دابەش دەبێت بەسەر دووبەش دا، ئەو دووبەشەش بریتین لە:

یەکەم جێ بەجێکردنی فەرمانەکای خواوەند: واتە هەر شتێك کە خواوەند فەرمانی پێ کردووە، وەك نوێژو ڕۆژو کۆمەك و حەج و هتد...

دووەم دوورکەوتنەوە لە قەدەکراوەکان: واتە دوورکەوتنەوەی تەواوەتی لەوەی کەخواوەند قەدەغەی کردووە، خواوەند فەرمانی داوە کە دوورکەوینەوە لە دزی و زینا و مەی خواردنەوە، هەروەها فەرمانی پێ داوین کە دوورکەوینەوە لە تەواوی ئەو شتانەی کە خراپن بۆ ژیان وەك جگەرە کێشان. کەواتە ئەی کوڕی گەنج لە جگەرە کێشان دووربکەوەرەوە لەبەر ئەوەی جگەرە خراپ ترین شتە کە مرۆڤ دای هێناوە بۆ وێران کردنی خۆی، جگەرە کێشان هۆکارە بۆ نەخۆش کەوتن، جگەرە کێش هەم ستەم لە خۆی دەکات و هەم ستەم لە



Scanned with CamScanner

دەوروبەرەکەی، کەواتە ئەی کوڕی گەنج لە جگەرە کێشان دووربکەوەرەوە لەبەر ئەوەی ئازاری دنیایی تێدایە، ئازاری گۆڕو ئازاری ڕۆژی قیامەتی تێدایە، چونکە خواوەند پرسیار لەگشت شتێك دەکات .... لە ئەبی برزە ئەسلەمەی لە زامنی پەیامبەرەوە دەڵێت ﴿لە ڕۆژی قیامەت دا پرسیار لە بەندە دەکرێت کە تەمەنی خۆی لەچی دا داناوە: چ کارێکی کردووە، چۆن پارەی دەست کەوتووە، لەچی دا خەرجی کردووە، چی بەسەر جەستەی دا هێناوە﴾. گەرهاتوو خواوەند پرسیاری لێ کرد، تۆ ئەخۆیت لەبەر ئەوەی برسیت، ئەخۆیتەوە لەبەر ئەوەی تینویت، کەواتە بۆچی ئەکێشیت؟! ئایا ئەتوانیت ئەم پرسیارەی وەلأم بدەیتەوە؟

گەنجە کە ووتی: بۆ زانیارییت، من جگەرە ئەکێشم.

کەسی دانا ووتی: هەر ئێستا لەگەڵ مندا دووبارەی بکەرەوە: من جگەرەم ئەکێشا، سوپاس بۆ خوا کەهەر لەئێستاوە من لەم خووە ڕزگارم بووە.... گەنجەکە لەگەڵی دا ووتی یەوە.... دواتر ووتی: من هەر لەئێستاوە وازم لە کێشانی جگەرە هێنا...

کەسی دانا ووتی: تۆ جگەرەت تەرك کرد لەبەر ئەوەی خواوەند لێت ڕازی بێت، تۆ بەجێت هێشت لەبەر خواوەند، ئەوکەش کە واز لە شتێك ئەهێنێت لە ڕێی خواوەند دا، خواوەند دواجار قەرەبووی دەکاتەوە. خواوەند قەرەبووت دەکاتەوە بە پارە و تەندروستی و هاوسەری باش و ئاسوودەیی لە ژیاندا، هەروەها بە کەسانێك کەخۆشت



Scanned with CamScanner

دەوێن و خۆشیان دەوێت، بیهێنەرە پێش چاوت کە تۆ لە رێی خواوەند و بۆ خواوەند ببووریت و خۆشەویستی بکەیت، بەدڵنیاییەوە خواوەند لەوە باشتر پێ دەبەخشێت، زۆر لەوەزیادتر پێ دەبەخشێت کە وێنای دەکەیت.

گەنجەکە ووتی: سوپاس بۆ خوا کە من وازم لە جگەرە کێشان هێنا.

کەسی دانا ووتی: ئەمە بەس نی یە، پێویستە تۆ یارمەتی زۆرترین ژمارە لە خەڵکی بدەیت بۆ ئەوەی رزگاریان بێت لەم خووە خراپە....

گەنجەکە ووتی: یارمەتی زۆرترین ژمارە لە خەڵك دەدەم کە واز لە کێشانی جگەرە بهێنن، هەروەها خراپی یەکانی ئەم خووە شیان پێ دەڵێم بۆ ئەوەی وازی لێ بهێنن تا خواوەند لێیان ڕازی بێت و سوود ببینن لەڕووی تەندروستی یەوە، لەبەر ئەوەی بەبێ تەندروستی کار ناکرێت و ناتوانرێت بڕیار بدرێت.

•

## نوێژکردن

گەنجەکە ووتی: ئەی دوای ئەوە؟

کەسی دانا ووتی: نوێژکردن لەکاتی خۆی دا بەشێکە لەگوێ بەفەرمان بوون، لەبەر ئەوەی پێویستە کە پەیوەندی بە خواوەندەوە بکرێت، کاتێك کە خواوەند لە گشت شتێك مەزنترە، باشتر زایە بەر لەوەی نوێژ بکەیت بزانیت بۆ ئەوکارە ئەکەیت، کاتێکیش کە نوێژ ئەکەیت ئەبێت بە دروستی ئەوکارە بکەیت ، کاتێکیش کە کات تەرخان



Scanned with CamScanner

دەکەیت بۆ کارێك، پێویستە ئەو کارە دروست بێت بۆ نمونە کاتێك کە تۆ زەکات ئەکەیت باشتر وایە کە بەشێوەیەکی دروست ئەوکارە بکەیت، یارمەتی ئەو کەسانە بدەیت کەرێگایان وون کردووە، بەو کارە خۆشت سوودمەند دەبیت.

گەنجەکە پرسی: چۆن سوودی لێ وەربگرم؟

کەسی دانا: یارمەتی بدە، دەست بکێشە بە شانی دا، بە ڕووی دا پێ بکەنە، ڕێگە بدە لەم ڕێگەیەوە خواوەندیش دەرووت لێ بکاتەوە. ئەبێ زەڕ لە پەیامبەر ئەگێڕێتەوە و دەڵێت ﴿ڕووکراوەیت لە بەرامبەر براکەت دا چاکەیە، فەرمان بە چاکە و نەهی کردن لە خراپە چاکەیە، ڕێنوێنی کردنی کەسێك بۆ ئەوەی لەسەردەمی گومڕایی دا خۆی بدۆزیتەوە، چاکەیە. ڕۆشنایی تۆ بە کەسێك کە توانای بینینی نەبێت چاکەیە، لابردنی بەرد و درك و ئێسك و پروسك لەسەر ڕێ چاکەیە، لە دەفری خۆ دەرهێنان و کردنە ناو دەفری براکەتەوە چاکەیە﴾ "بەریوایەتی ترموزی". گەر تۆ ئەو کارانە بکەیت، چاکە گەلێکی مەزنت دەستگیر دەبێت لەیەك کاردا، هەرکارێك لە پێناو خواوەند دا بکەیت سوودی لێ وەردەگریت لەبەر ئەوەی ئەو کارە لە خواوەندت نزیکتر دەکاتەوە.

کەسی دانا: ئێستا جارێکی تر بۆم دووبارە بکەرەوە چیمان ووت.

گەنجەکە ووتی: لێ بووردنی تەواوەتی.

پێی ووت: ئەی دوای ئەوە



Scanned with CamScanner

ووتی: خۆشویستن له ڕێگەی خواوەند دا و بۆ خواوەند، دوای ئەوە، بەخشینی بێ مەرج و دوای ئەوەش باوەڕهێنان بە خواوەند.

کەسی دانا: لێرەدا کەباسی باوەڕهێنان بە خواوەندت کرد ئەتوەستێنم.... ئەزانی مانای باوەڕ هێنان بە خواوەند چی یە؟

ووتی: ئەزانم

کەسی دانا: چی یە؟

گەنجە ووتی؛ واتا باوەڕم بە بوونی خواوەند هەبێت.

کەسی دانا: ئەمە بەس نی یە....

گەنجەکە پرسی: ئەی چی ئەگەیەنێت؟

کەسی دانا: باوەڕ هێنانی تەواوەتی بە بوونی خواوەند بە مانای باوەڕهێنان بە تەواوی ئەوشتانەیە کە خواوەند و پەیامبەر هێناویانەتە بوون و باوەڕهێنانە بە تەواوی ئەو کتێب و نوسراوانەی کە باسیان لێوە کراوە یاخود باسیان لێوە نەکراوە. هەروەها باوەڕهێنان بە تەواوی ئەو پەیامبەرانەی کە باسیان لێوە کراوە یاخود ناویان نەهێنراوە، ئێستا لەگەڵ مندا بڵێرەوە: ئەی خواوەند من باوەڕم بە گەورەیی و فریشتەکان و پەیامبەرەکان و بوونەوەرەکانت هەیە، تۆ ئەو خواوەندەیت کە هاوبەشت نی یە، تۆ یەکەمین و دواهەمینیت، تۆ ئاشکراو نهێنیت، تۆیت پێشەکی و کۆتایی، تۆیت بەخشندە، تۆیت تۆڵەسێنەرەوەی مەزن، تۆیت گەورەترین بەخشندە...



Scanned with CamScanner

لێرەدا گەنجەکە دەستی بە گریان کرد لە خۆشی ئەوقسانە. دواتر کەسی دانا قسەکەی بەم شێوەیە تەواو کرد: باوەڕیشم وایە کە بە هەشت ڕاستە، کە ئاگر ڕاستە، باوەڕم بەدوارۆژ هەیە، باوەڕم بەفریشتەکان هەیە، باوەڕم بە تەواوی ئەو شتانە هەیە کە خواوەند دروستی کردوون تۆبەم شێوەیە دەبیت بە باوەڕ هێنەرێکی ڕاستەقینە.

گەنجەکە ووتی: باوەڕم هێنا بە پەروەردگار ....

کەسی دانا پرسی: باوەڕت بەوەش هەیە "موحەممەد د.خ" نێردراوی خواوەندە؟

گەنجەکە ووتی: سەروەرمان محمد نێردراوی خواوەندە، باوەڕم بەوەش هەیە کە بەهەشت ڕاستە، باوەڕیشم وایە کە دۆزەخیش ڕاست و ڕەوایە، باوەڕم بە فریشتەکانیش هەیەو باوەڕم بە دوا ڕۆژ هەیە، باوەڕم بە تەواوی پەیامبەرو نێردراوەکانی خواوەند هەیە، چ ئەوانەی کە باسیان لێوە کراوە چ ئەوانەی کە باسیان لێوە نەکراوە،

کەسی دانا ووتی: تۆ ئێستا باوەڕت بە خواوەند هێناوە، ئێستا ڕوو لە خەڵکی بکەو دوای ئەوەی کە چەکدار بوویت بەم چەکە جوانانەی خواوەند.

لێبووردەیی، خۆشویستنی لەرشێی خواوەند و بەخشین بەبێ مەرج، باوەڕهێنان بە خواوەند.... دواتر کەسی دانا بێ دەنگ بوو دەستی کرد بە پێکەنین.

گەنجەکە ووتی: پێ ئەچێت زۆر شتی زیادتر مابێت بۆ فێر بوون....



Scanned with CamScanner

کەسی دانا ووتی: بەڵێ سەرجەم ئەم شتانە جوانن، بەڵام بەس نین...

گەنجەکە پرسی: چی تر ماوە؟

## نیەت پاکی

لێرەدا کەسی دانا وەڵامی دایەوە: نیەتی پاکی، ئەگەر ووردبیتەوە ئەبینیت کە باوەڕهێنان بەخواوەند ئەتگەیەنێت بەگوێ ڕایەڵی گوێڕایەڵیش دەتگەیەنێت بە نیەت پاکی لەبەر ئەوەی تۆ ناتوانیت کە گوێ ڕایەڵی کەسێك بیت گەردڵنیا نەبیت لەوی کە ئەو توانایەی هەیە کە هەر شتێك کە تۆ داوای لێ بکەیت بۆت بهێنێتە دی، تۆ دادوەرێك ئەگریت و دڵنیاشیت کە دەتوانێت بەرگریت لێ بکات، لەبەر ئەوە تۆ بەگوێی ئەکەیت، کاتێك کە دەچیتە لای پزیشك و ئەویش کاتت بۆ دیاری ئەکات بۆ ئەنجامدانی نەشتەرگەری یەکی دیاری کراو، بێ گومان پزیشکەکە لەکاتی دیاری کراودا ئەو کارەت بۆ. لەبەر ئەوە تۆش بە گوێی دەکەیت، هەر شتێکیشت پێ بڵێ بە گوێی ئەکەیت، ئەو بێ هۆشت دەکات و تۆش بۆ ئەوکارە بە گوێی ئەکەیت، کار لەسەر دڵت دەکات و تۆش هیچ ناڵێیت، لەبەر ئەوەی تۆ لە تواناکانی دکتۆرەکە دڵنیایت. باوەڕ هێنان بە خواوەند دەتگەیەنێت بەگوێ ڕایەڵی گوێ ڕایەڵیش دەتگەیەنێت بەو ڕێگەیەی کەلە دواتردا دێت کە ئەویش نیەت پاکی یە، تۆ ناتوانیت باوەڕت بەخواوەند هەبێت و پەیڕەوی



Scanned with CamScanner

کردنت لەفەرموودەکانی تەواو بێت و نیەتیشت نەبێت، لەبەر ئەوەی نیەت پاکی بۆ خوایەو لە خوایە خواوەند دەفەرمووێ:﴿نیەت پاکانە لە خوا بپارێنەوە تەنانەت گەر کافرەکانیش پێیان ناخۆش بوو﴾"سورەتی غافر ئایەتی ١٤". هەروەها دەفەرموێت ﴿هەر کەسێك کە دەیەوێت بگات بە دیداری خواوەندەکەی باکاری باش بکات و کەس نەکاتە هاوبەشی خواوەند﴾ سورەتی کەهف ئایەتی ١١٠". هەروەها دەفەرموێ: ﴿تەنها فەرمان بە عیبادەتی خواوەند کراوە بەنیەت پاکی لە دین و نوێژ کردن و زەکات کردن لەبەر ئەوەی ئەوە دینی ڕاستگۆکانە﴾"سورەتی بەینە ئایەتی ٥". لە ئەمیری بڕوادارەکان ئەبێ حەفص عومەری کوڕی خەتاب ئەگێڕنەوە کە دەڵێت:﴿بیستم پەیامبەر دەیفەرموو: کارەکان بە نیەت دەپێورێن، هەر کەسێك ئەوەیە کە نیەتی دەکات، ئەوکەسەی نیەتی ڕۆیشتن بە ئاڕاستەی خواوەند و پەیامبەرەکەی بکات، ئەوا بەئاڕاستەی خواوەندو پەیامبەرەکەی ئەڕوات، ئەو کەسەش کە نیەتی ڕۆیشتن ڕووەو دنیا بکات، ئەوا ڕووەو دنیا دەڕوات، ئەوکەسەش کە نیەتی جووت بوون بێت لەگەڵ ئافرەتێك دا ئەوا بەو ئاڕاستەیە دەڕوات﴾. هەروەها لە ئەبی هورەیرە دەگێڕنەوە کە دەڵێت:﴿بیستم کە پەیامبەر دەیفەرموو: خواوەند سەیری جەستەو وێنەکانتان ناکات بەڵکو سەیری دڵ و کردەوەکانتان دەکات﴾. ئەمەیە نیەت پاکی. کاتێك کە تۆ نیەت پاکیت بەرامبەر بە خواوەندن ئەوکاتە ئەو نیەت پاکی یە دەبێتە خەسڵەت و سیمات، خواوەندیش دەرووت لێ



Scanned with CamScanner

دەكاتەوە، هەر كردەوەیەك بەبێ نیەت پاكی ئەنجام بدەیت وەك ئەوە وایە كەتۆ هیچت نەكردبێت لەبەر ئەوەی تەنها كاتێك هەست بەخۆشی كارەكەت ئەكەیت كەبەنیەت پاكی پەیوەندیت بەخواوەندەوە بكەیت، خۆشی گوێ ڕایەڵیش لە پەیوەندی كردنە بە خواوەندەوە لەبەر ئەوەی گوێ ڕایەڵی دەبێت بۆ خواوەند بێت و دڵسۆزیش هەر بۆ خواوەند بێت.

## دڵسۆزی

لێرەدا گەنجەكە ووتی : ئەی دوای ئەوە؟

كەسی دانا ووتی: وەفاداری، خواوەند لە كتێبە پیرۆزەكەی دا دەفەرموێت:﴿بەوەفابن بۆ ئەو پەیمانانەی دەی دەن لەبەر ئەوەی پەیمان دان بەر پرسیارێتی یە﴾"سورەتی ئەسرا ئایەتی ٣٤". هەروەها دەفەرموێت:﴿ئەی ئەوكەسانەی كە باوەڕتان هێناوە وەفادار بن بەو بڕیارانەی ئەیدەن﴾"سورەتی مائدە ئایەتی ١". هەروەها عبدواللە كوڕی عەمر كوڕی عاص لە زمانی پەیامبەرەوە دەڵێت:﴿چوار خەسڵەت هەیە ئەگەر لەهەر كەسێكدا هەبێت ئەوكەسە كەسێكی دووڕووە، وەئەگەر تەنها خەسڵەتێكی تێدا بێت ئەوا ئەو كەسە یەكێك لە خەسڵەتەكانی دووڕووی تێدایە تا ئەوكاتەی كە وازی لێ دەهێنێت: ئەگەر خیانەت لە ئەمانەت بكات، ئەگەر درۆبكات، ئەگەر پەیمان بدات و پەشیمان بێتەوە، ئەگەر بێ هۆ دژایەتی كەسێك بكات﴾.



Scanned with CamScanner

دواتر کەسی دانا سەیرێکی کردو پرسی: ئەگەر هاتوو کەسێك پەیمانت پێ بدات و دواتر قسەکەی خۆی نەباتە سەر هەست بەچی ئەکەیت؟

گەنجەکە وەڵامی دایەوە: زۆر لێی تووڕە ئەبم.

کەسی دانا پرسی: ئایا جارێکی تر بڕوای پێ ئەکەیتەوە؟

گەنجەکە وەڵامی دایەوە: نەخێرچونکە پێشتر درۆی لەگەڵدا کردووم و قسەکەی خۆی نەبردۆتە سەر، چۆن ئەتوانم جارێکی تر متمانەی پێ بکەمەوە؟

کەسی دانا: خواوەند نمونەی بەرزە، ئەکرێت کە گوێ ڕایەڵ و باوەڕدار و دەرون پاك بیت، بەڵام لەهەمان کاتدا پەیمانی خۆشت لەگەڵ خواوەند دا نەبەیتە سەر، بەم پێ یە تۆ ناتوانیت ئەو پەیمانانەی کەبەخەڵکییت دابوو بیبەیتە سەر... نەبردنە سەری پەیمان گشت شتێکت لە دەست دەدات ..... لە باوەڕ و گوێ ڕایەڵی و نیەت پاکی یەوە.

باوەڕ هێنان بەخواوەند وات لێ ئەکات کە هەست بە جوانی گوێ ڕایەڵی بکەیت، بۆ ئەوەی هەست بەو جوانیەش بکەیت، پێویستە نیەت پاکییت بەرامبەر بە خواوەند ودواجار دڵسۆز. تا ئەو کاتەی کە تۆ دڵسۆزی خواوەندی خۆتیت، تۆ خاوەنی ئەو خەسڵەتانەیت هەروەك خواوەند دەفەرموێت: ﴿ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە بۆچی

ئەوشتانەی ئەیلێن کاری پێ ناکەن؟ زۆر نەویستراوە لەلای خواوەند کەشتێك بلێن و کاری پێ ناکەن﴾"سورەتی صەف ئایەتی ٢ و ٣".

لە گرنگترین بنەماکانی گوێ ڕایەڵیش بۆ خواوەند دڵسۆزی یە. گوێ ڕایەڵی بە گرنگترین بنەماکانی باوەڕ دادەنرێت، هەروەك ئەبینیت ئەی گەنج، سەرجەمی ئەم کارانە بنەمان بۆ گەیشتن بە ڕێگەی بالابوون، مرۆڤەکان هۆکارەکان لە پێش چاو دەگرن و گوێ بەسەرچاوەی دروست بوونی ئەو هۆکارانە نادەن، تەنها بەلەبەر چاوگرتنی هۆکارەکان سەرکەوتن بەدەست نایەت، بۆ نمونە وەك لە حاڵەتی تۆدا ڕووی دا ڕەنگە گوێ بەسەرجەم هۆکارەکانی بدەیت و سەرباری ئەوەش هەر سەرکەوتوو نەبیت، بەلام کاتێك کە تۆ گوێ بە هۆکارەکان دەدەیت وپشت بە خواوەندیش دەبەستیت، بێ گومان سەرکەوتوو دەبیت تەنانەت گەر لە بوارەکەی خۆشت دانەبێت... وەك بازارسازی، بەڕێوەبردن، خزمەت گوزاری کردن و پەیوەندی گشتی، تەنها بەپشت بەستن بەخواوەند دەرەنجامێك بە دەست دەهێنیت کە چاوەڕوان ناکرێت.

لێرەدا دووبارە کەسی دانا سەیری گەنجەکەی کردو پرسی: چی فێر بوویت تا ئەم ساتە؟

گەنجەکە وەلامی دایەوە: فێر بووم کە پەیوەندی دروست کردن لەگەڵ خواوەند دا لە گرنگترین بنەماکانی سەرکەوتنە.

کەسی دانا پرسی: چۆن پەیوەندی بە پەروەردگارەوە دەکەین؟



Scanned with CamScanner

گەنجەکە وەڵامی دایەوە: لەڕێگەی لێبووردنەوە.

کەسی دانا: بۆچی؟

گەنجەکە ووتی: بۆ ئەوەی ئەو بارە گرانەی سەرشانم دابنێم و خۆم ڕزگار بکەم لەو ووزە نێگەتیڤەی کە لەخواوەند دوورم دەخاتەوە .

کەسی دنا: ئەی دوای ئەو؟

گەنجەکە ووتی: خۆشویستن لە ڕێی خواوەند بۆ خواوەند، بەخشین بەبێ مەرج و گلەیی نەکەم گەر بەخشیم و هیچم لەبری بە دەست نەگەیشت، دواتر باوەڕ....

کەسی دانا: ئەی باوەڕ چی دەگەیەنێت؟

گەنجەکە وەڵامی دایەوە: باوەڕهێنان بە خواوەند و بەگشت ئەو شتانەی کە بەفەرمانی پێ دەکات، هەروەها باوەڕهێنان بەوەی کە خواوەند یەکەمین و دواهەمین و ئاشکراو نهێنی یە. هەروەها باوەڕم هێناوە بەوەی کە خواوەند والاترین و مەزنترین تۆڵەسێن و بەخشندەترینە. باوەڕهێنان بەسەرجەم ئەو شتانەی کە خواوەند هێناویەتی یە بوون و فەرمانی پێ داوە، هەروەها باوەڕهێنان بە تەواوی ئەو پەیامبەرو نێردراوانەی کە باسیان لێوەکراون یاخود ناو نەهێنراون، باوەڕیشم وایەکە بەهەشت ڕەوایە و دۆزەخیش ڕەوایە...

کەسی دانا زەردەخەنەیەکی کردو و ووتی:زۆر فێربوویت کوڕی گەنج.

گەنجەکە ووتی : تێکڕای لە تۆوە فێر بووم.



Scanned with CamScanner

کەسی دانا ووتی: من تەنها هۆکارێکم لە ناو ئەو هۆکارانەی کە رێگە خۆشکەرن لە رێگای بالآبوون دا.

خواوەند منی کردووە بە هۆکارێك بۆ ئەو کارە، تۆش یارمەتی خەڵکانێکی زۆر دەدەیت...

گەنجەکە ووتی: منیش پەیمان ئەدەم...

کەسی دانا: هیچ کات بەشتێك پەیمان مەدە کە نەتوانیت بیبەیتە سەر، لەکاتی گونجاودا پەیمان بدە.

گەنجەکە ووتی: ئەمە دواهەمین شتە؟

کەسی دانا: نەخێر، تۆ بەتەواوی شتەکان هەڵساویت سەرەتا لەلێ بووردەیی دەستت پێ کردو دواتر خۆشەویستی لە رێگەی خواوەند، بەخشینی بێ مەرج، باوەڕی تەواوەتی بەخواوەند، گوێ ڕایەڵی، بەم پێ یە خۆت لە پەیوەندی یەکی نزیکتردا دەبینیتەوە لەگەڵ خواوەند دا، بەلآم شت گەلێکی دیکەش ماوە وەك: پشت بەستن بە خواوەند.

## پشت بەستن بە خواوەند

گەنجەکە پرسی: پشت بەستن بە خواوەند چی دەگەیەنێت؟

کەسی دانا: پێویستە کە پشت بەخواوەند ببەستیت، بەشێوەیەك کە خواوەند دەفەرموێت گشت هۆکارەکان لەبەر چاو بگرە و پشت بە خواوەند ببەستە، هەروەك لە سورەتی ئال عومران ئایەتی ١٥٩ دا دەفەرموێت:﴿گەر دەست بەکاربوویت، پشت بە خواوەند ببەستە،

لەبەر ئەوەی خواوەند ئەوکەسانەی خۆش دەوێت کە پشتی پێ دەبەستن﴾.

مانای ئەم ئایەتەش ئەوەیە کەسەرەتا بڕیاری دەست بەکار بوون بدەن، بۆ ئەوەی ئامادەبیت و پشت بەخواوەند ببەستیت پێویستە کەنیەت بهێنیت، لەبەر ئەوەی تەنها بە ئارەزوو کردن نیەت لە دایك دەبێت، کاتێکیش کە بڕیار دەدەیت کە ئامانج بە دەست بهێنیت، نیەت لە دایك دەبێت، کەواتە پێویستە ئەی کوڕی گەنج ئەو بزانیت کە نیەت چی یە؟ لەبەر ئەوەی نیەت بریتی یە لە قوڵایی بیرکردنەوەی تۆ، نیەت ویژدان دروست دەکات، ویژدانیش هەست و هەڵسوکەوت دروست دەکات، دواتر دەچێتە دنیای دەرەکی یەوە، لەبەر ئەوەی خواوەند سەیری نیەتەکانی دەکات لەناو دڵی دا. هەروەها سەیری ویژدانەکان دەکات، لەبەر ئەوە پێویستە لە کاتی دەست پێ کردن بەهەر کارێك بڵێت: نیەتم هێنا کە هۆکارەکان لەبەر چاو بگرم و پشت بە تۆ ببەستم ئەی خواوەند، نیەتی باوەڕی تەواوەتیم کردووە خواوەند، نیەتی گوێ ڕایەڵی تەواوەتی و نیەت پاکی تەواوەتیم کردووە ئەی خواوەند، نیەتم وایە گشت هۆکارەکان لەبەر چاو بگرم. نیەتم وایە بە تەواوەتی پشت بە تۆ ببەستم ئەی مەزنترین... دواتر دەست بەکار دەبیت لەسەر ڕێگای باڵا بوون ... نیەت پێش گشت شتێك ئەکەوێت... دواتر کەسی دانا ڕووی کردە گەنجەکەو پێی ووت: ئێستا ئەی کوڕی گەنج نیەتت هێناوە؟



Scanned with CamScanner

گەنجەکە وڵامی دایەوە: بەڵێ نیەتم هێناوە.

کەسی دانا ووتی: نیەتت لەسەر چی هێناوە؟

گەنجەکە وەڵامی دایەوە: نیەتم هێناوە لەسەر باوەڕهێنان بەخواوەند...

کەسی دان: ئەی دوای ئەوە؟

گەنجە کە ووتی: نیەتی گوێ ڕایەڵی تەواوەتی و نیەت پاکیم هێناوە.

پێی ووت: چی تر؟

وەڵامی دایەوە: نیەتی دڵسۆزی تەواوەتیم هێناوە...

کەسی دانا ووتی: بەم شێوەیە تۆ ئێستا زۆر باشی بەڵام تەنها شتێك ماوە.

گەنجەکە وتی چی یە؟

کەسی دانا: گەشبینی.

## گەشبینی

لێرەدا کەسی دانا بە دووچاوی پڕشنگ داری گەشبین سەیری گەنجەکەی کردوو ووتی: باوەڕدار هەرگیز باوەڕەکەی تەواو نابێت گەر گەشبین نەبێت بەوەی کە خواوەند پارمەتی دەدات، لەبەر ئەوەی خواوەند لەوە دڵنیایی کردوویەتەوە کە هەرگیز ئەوکەسەی کە کاری چاکە دەکات، پاداشتەکەی نافەوتێت. تۆش کاتێك کە دەتەوێت دەست بەکار بیت و هەموو هۆکارەکان لەبەرچاو دەگریت، بەتەواوەتی پشت



Scanned with CamScanner

بە خواوەند دەبەستیت لەوپەڕی گوێ ڕایەڵی دا، خۆشەویستی دەکەیت لە ڕێگەی خواوەندا و نیەت پاك و دڵسۆزیت بەرامبەر بە خواوەند. دوای گشت لەو کارنە گومان دەکەیت لەوەی کە خواوەند ئەوەت پێ نەبەخشێت کە داوای دەکەیت؟

گەنجەکە ووتی: نەخێر بە دڵنیاییەوە ئەوی کە دەمەوێت پێم دەبەخشێت.

کەسی دانا ووتی: ئەمە ئەو دڵنیاییە کە پەیامبەر ئامۆژگارییمان دەکات کەهەمان بێت لەوەی کە چاوەڕوانی هاتنی وەڵام بین لە دوای دووعا کردنمانەوە. ئەمکارەش هەنگاوی داهاتوومانە کوڕم، کەبریتی یە لە پاڕانەوە و زیکر کردن.

## پاڕانەوە و زیکر کردن

لێرەدا کەسی دانا ووتی: کوڕەکەم... تا ئەو کاتەی کەلە ژیان دایت پێویستە لەسەرت کەلە خواوەند بپاڕێیتەوە. پاڕانەوە باشترین کارە بۆ نزیك بوونەوە لە خواوەند. تەنانەت ئەگێڕنەوە کە پەیامبەر فەرموویەتی کە پاڕانەوە خودی خوا پەرستی یە.

زیکر کردنیش توێشووی باوەڕدارە لە ڕێگای گەیشتنی بە خواوەند، باشترین زیکریش ئەوەیە کە بڵێی: جگە لە خواوەند هیچ خواوەندێکی دیکە نیە.... ئەم ووشەیە بە بەردەوامی بەکاربهێنە، هەروەها بەردەوام ئەم وشەیەش لەگەڵ خۆت دا بڵێرەوە: سوپاس بۆخوا...



Scanned with CamScanner

هەرکاتێك شتێکت تووش بوو بڵێ: سوپاس بۆخوا.... بەردەوام سوود لەم کارە ئەبینیت، تەنانەت گەر هەست بە مەترسیتریش بکەیت بڵێیت: سوپاس بۆ خوا، ئەو ترسە لێت دوور ئەکەوێتەوە، گەر باوەڕت بە خوا بێت هەمیشە دەروازەیەك بە ڕووت دا دەکاتەوە و بەشێوەیەك ڕزق و ڕۆزیت دەدات کە هەر لە بۆ چوون دا نەگونجێت، تا ئەو کاتەی کەلە ژیان دایت ئەبێت بڵێت: تەنها خواوەند بوونی هەیە. هەروەها: سوپاس بۆ خوا. هەرکاتێك دەرفەتت هەبوو ئەبێت ئەوکاتەت پڕ کەیتەوە بە هێنانی ناوی خواو سوپاس کردن و پاڕانەوە لێی و پیاهەڵدانی، بەم شێوەیە پەیوەندیت بەردەوام دەبێت لە گەڵ خواوەند دا.

گەنجەکە پرسی: ئەمە کۆتاییە؟

کەسی دانا: نەخێر ئەمە بەشێکی بچوك بوو لەوەی کە خواوەند پێمانی بەخشیوە، شت گەلێکی دیکەی زۆرماوە کەدواتر لەرێگای بالابوون دا فێری دەبین .... کوڕەکەم ئەمە یەکەمین بنەمای پەیوەندی کردنە بە خواوەندەوە.

گەنجەکە ووتی: ئەی دوای ئەوە، بنەمای دووەم چی یە؟

کەسی دانا ووتی: ئاکار

# ئاکـــار

ئاکار بە گرنگترین خەسڵەتی کەسی باوەڕدار دادەنرێت، ئەوکەسەی کە دڵسۆزە و خواوەندی خۆش دەوێت، ڕەنگە لە کارێکی دیاری کراودا باش بیت، یاخود لە بابەتێك دا کەسێکی دیاربیت... بەڵام گەر ئاکارت باش نەبێت چۆن دەتوانیت مامەڵە لەگەڵ خۆت و ئەوانی دی دا بکەیت؟!

لەڕێی ئاکارەوە دەتوانیت دزە بکەیە ناو دڵی ئەوانی دی یەوە... دەتوانیت بەوەی کە دەتەوێت قەناعەتیان پێ بکەیت... بە ئاکار بەرژەوەندی ئەوانی دی دەخەیتە پێش بەرژەوەندی خۆتەوە.

لەم بارەیەوە خواوەند بەپەیامبەرە مەزنەکەی دەڵێت:﴿تۆ خاوەن ئاکارێکی زۆر بەرزیت﴾ "سورەتی قەلەم ئایەتی ٤". لێرەدا خواوەند تەنها باس لە ئاکار ناکات بەڵکو مەبەستی ئاکارێکی بەرزە. هەروەها ئەم فەرموودەیەی پەیامبەری گەورە جەخت لەسەر ئەم ئایەتە دەکاتەوە کەدەفەرموێت:﴿ من نێردراوم بۆ ئەوەی بنەماکانی ئاکار تەواو بکەم﴾.

ئەی کوڕی گەنج، گەر لەم دوو ووتە بە نرخە وورد بیتەوە بۆت دەردەکەوێت کە خواوەند لەسەر خەسڵەتێکی پەیامبەر جەخت دەکاتەوە کە پەیامبەر خاوەن ئاکارێکی زۆر بەرزە، ئەو پەیامبەرەی کە نێردراوە بۆ ئەوەی ئاکاری جوان تەواو بکات.

پێویستە تۆ هەمیشە ئاگاداری ئاکارت بیت، هەورەها ئاگات لە چۆنیەتی قسە کردنت بێت لەگەڵ ئەوانی دی دا. من لە چەند ساتێکی کەمدا هاوکێشەیەکی سادەت پێ ئەدەم لەسەر چۆنیەتی گەیشتن بە ئاکارێکی باش، لەبەر ئەوەی تۆ بەبێ ئەو ئاکارە ناتوانیت لەگەڵ دنیا دا ژێ بکەیت.... کوڕە گەنجەکە لەسەر ئەم قسەیە وەستا و بەکەسی داناى ووت: من کتێبیکم خوێندەوە کە باسی لەیەکێك لە زانکۆ بەناوبانگەکەکانی جیهان دەکرد و تیایدا هاتبوو کە توانا پیشەیی یەکان تەنها ڕێژەی (٧٪) پێك ئەهێنن، بەڵام ئاکار ڕێژەی (٩٣٪) پێك ئەهێنێت، من ئەوکاتە لەم کتێبە هیچ تێ نەگەیشتم و وازم لەخوێندنەوەی هێنا، لەبەر ئەوی هیچی لێوە فێر نەبووم، بۆ نمونە من قۆناغی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی و و زانکۆم تەواو کرد و دواتر خوێندنی باڵا و پلەی ماجستێرم بە دەست هێناو دواجار بڕوانامەی دکتۆرا، ئێستا تێکڕای ئەم قۆناغانە تەنها ڕێژەی (٧٪) پێك دەهێنێت؟!. ئێستاش من گوێ لەقسەکردنت ئەگرم لەسەر ئاکار، بەوپێ یەی کە ئاکار گشت شتێکە و لە گشت شتێکی دیکە گرنگترە و لەلای خواوەندیش زۆر گرنگرە و زیادتر لە نزیکت دەکاتەوە لێی، بە ئاکار



Scanned with CamScanner

لەگەڵ ئەوانی دی دا مامەڵە دەکەیت، هەر بەئاکار وادەکەیت کە ئەوانی دی تۆیان خۆش بوێت و لێت کۆببنەوە، بەڵام چۆن توانا پیشەیی یەکان تەنها ڕێژەی (٧٪) پێك دەهێنێت؟!

کەسی دانا وەڵامی دایەوە: لەبەر ئەوەی ڕەنگە تۆ بتوانیت سەختترین کار فێر بیت، گەر کەسێکیش بتوانێت فێری کارێك ببێت، مانای وایە درك بەو کارە دەکرێت دەخرێتە لەناو کتێبەوە و ڕەنگە کەسێکی تریش بتوانێت فێری بێت لەماوەی ڕۆژێك یاخود مانگێك یا ساڵێك دا، بەهەرحاڵ لە کۆتایی دا فێری دەبێت، بەڵام هۆی چی یە کە هەندێك کەسی سەرکەوتوون و هەندێکی دیکە سەرکەوتوونین، هەندێك باشن و هەندێکی دیکە باشنین، لەگەڵ ئەوەش دا تێکڕای خەڵکی خاوەنی ئەو چوارشتەن کە پێشتر باسیان لێوە کرد، سەرجەم مرۆڤایەتی خاوەنی کەرەستەی خاون واتە پێنج هەستیارەکە، خاوەنی ووزەن، هەروەها خاوەنی شێوازی بیرکردنەوە و لۆژیك و توانی لێکدانەوەن، کات (٢٤) کاتژمێرە لە ڕۆژێك دا، کەواتە جیاوازی چی یە لە نێوان مرۆڤێك و مرۆڤێکی دیکە دا؟ جیاوازی چی یە لە نێوان مرۆڤێکی باڵا و مرۆڤێکی ئاسایی دا؟! لە کۆی باسەکانی پێشوومانداهۆکاری ئەم جیاوازییەت بۆ ڕوون دەبێتەوە، دەردەکەوێت کە ئاکاری مرۆڤی باڵا بەرزە، دوچاری هەر کێشەیەك بێت زۆر زوو ئەبوورێت، چونکە ئەوندە کاتی نی یە کە بەو شتانەوە لە دەستی بدات، ئەزانێت کە کاتی ئەو دیاری کراوە و ڕەنگە ئەم ساتەش دواهەمین ساتی ژیانی

بێت، ئەو بە شێوەیەکی دروست بیر دەکاتەوە، کەسی جیاواز هەمیشە پرسیار لە خۆی دەکات: ئەگرێت ئەم ساتە دواهەمین ساتی ژیانم بێت؟ وەلامیش: بێ گومان بەڵێ.... کەواتە پرسیار لە خۆت بکە: ئایا ئەوەی لەم ساتەدا ئەی کەیت ئەو ماندوو بوونە ئەهێنێت؟ ئەبینیت تۆ گەر ئاکارت باش نەبێت، بیرو هەستت گرژدەگرێت ، ئەبینیت کە هۆش و سۆزت گری گرتووە، لەم کاتەدا تۆ هیچ بە دەست ناهێنیت، ئاکار باشترین شتە لەم کاتانەدا. ئێمە قسەمان لەسەر باوەڕو لێ بووردن و بەخشینی تەواوەتی کرد، هیچ کات ناتوانیت ببووریت گەر باوەڕی تەواوەتیت بە خواوەند و گوێ ڕایەڵی و دڵسۆزی نەبێت، کاتێك کە بیر لە گشت ئەو شتانە ئەکەیتەوە ئەگەیت بە ئاکاری جوان، گەر مرۆڤ کار بکات لەسەر باشکردنی ئاکاری خۆی، لەلای خەڵکی خۆشەویست دەبێت و حەز دەکەن هەمیشە لەگەڵی بن، زۆر کات کەسە سەرکەوتووکان بەتەنهایی ئەبینرێن، هۆکەشی ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە کە خەڵکی حەز بە هاوڕێیەتی کەسێك ناکات کە بەد ئاکار بێت، ئاکاری جوان دەتگەیەنێت بە گشت شتێکی جوان، خواوەند ئێمەی لە شێوەی گەل و هۆزی جیاجیادا دروست کردووە لەبەر ئەوەی یەکتری بناسین، هەروەك لە سورەتی (حجرات) ئایەتی (١٣) دا دەفەرموێت:﴿ئەی خەڵکی ئێوەمان دروست کردووە لە نێرو مێ، کردومانن بە گەلً و هۆز بۆئەوەی یەکتر بناسن، باشترین کەستان بە باوەڕترین تانە، خواوەند لە گشت شتێك بەئاگایە﴾. هەروەك دەبینیت کەسەکان خۆیان بە دوور

دەگرن لەو کەسانەی کە ئاکاریان باش نی یە، خواوەند لە سورەتی ئال عومران ئایەتی ١٥٩ دا دەفەرموێت:﴿گەر ئاکارت ناشیرین بێت دەوروبەرت چۆڵ دەبێت و کەستان لە دەور نامێنێت﴾. بەهۆی ئاکار وخۆشویستنی خواوەند و ئەو زمانە شیرینەی کە زیکی خوا دەکات ئەو کەسانەی کەلەدەورتن هەست بە ووزەیەکی پۆزەتیڤ دەکەن.

گەنجەکە ووتی: پێم وابێت ئەوەی کە زیاتر ئەم بۆچوونە دەسەلمێنێت ئەو شیعرەی ئەحمەد شەوقی یە کە دەڵێت: تەنها ئاکاری میللەتانە کە دەمێنێتەوە چونکە بە نەمانی ئاکار میللەتیش نامێنێت .

کەسی دانا: تەواو ڕاستە، ئەوەی ئەو قسەیەش دەسەلمێنێت ئەو شیعرەی حافز ابراهیم کەدەڵێت: گەر خواوەند منداڵێ:ی ساڵحی پێ بەخشیت... بزانە کە یەزدان هەڵی بژاردوویت.

کەسی دانا: لەم جوانی یە بنواڕە کوڕم ، تۆ ئێستا هەر قسەیەك کە من دەی کەم قسەیەکی جوانتری بەسەردا دەهێنی، ئەم قسەیە ئێستا لە تۆوە دەرچوو لەبەر ئەوەی کە تۆ خواوەندت خۆش دەوێت و خواوەندیش زمانت شیرین دەکات ئەم کارەت وادارم ئەکات ئەم پەندە بڵێم: (خۆ بەکەم زانی، سەربەرزی یە، پشوو درێژی لە دانایی یەوە دێت. دادپەروەریش لە هێزەوە، بەخشینیش لە تواناوە).

گەنجەکە ووتی: ئەم ووتەیە زۆر جوانە، ئێستا هەست ئەکەم کە ئامادەم زۆرترین ژمارە لە خەڵك ببینم، چونکە بە خۆشویستنی خواوەند و گوێ ڕایەڵی و نیت پاکیم بۆی چەکدارم .

کەسی دانا لێی نزیك بۆوە و ناوچەوانی ماچ کرد پێی ووت: خواوەند دەرووی لێکردوویتەتەوە، ئەشبینیت تا دێت خواوەند زیاتر دەرووت لێ دەکاتەوە، لەبەر ئەوەی تۆ توانیوتە پەی بە ژیری ببەیت لە ڕێگەی بالأ بوون دا. لە ڕاستی دا هەرشتێك کە تۆ فێری بوویت، لە ڕێگەی خواوەندەوە فێری بوویت بۆ خواوەند، هەروەها مامەڵەی خەڵك لەڕێی خواوەندەوە بۆ خواوەند. خەڵکی ببووریت لەڕێی خواوەندەوە بۆ خواوەند، خەڵکیت خۆش بوێت لە ڕێی خواوەندەوە بۆ خواوەند، بەڵام شتێکی زۆر گرنگ هەیە ئەی کوڕی گەنج: کوڕەکەم هیچ کات بەو شێوەیە مامەڵە لەگەڵ خەڵك دا مەکە کە مامەڵەت لەگەڵدا دەکەن، ئەمە یەکەمین هونەری پەیوەندی کردنە بە خەڵکی یەوە، هەوڵبدە هەمیشە جیاکاری بکەیت لە نێوان کەسەکە و هەڵسوکەوتی دا.

گەنجەکە ووتی: تێ ناگەم، چۆن ئەتوانم جیاکاری بکەم لە نێوان کەسەکە و هەڵس و کەوتی دا؟

کەسی دانا: مرۆڤ باشترین دروستکراوی خواوەندە، ﴿مرۆڤمان بە باشترین شێو دروست کرد﴾ "سورەتی تین ئایەتی ٤". ئەوەندە شانازیمان بەسە کە خواوەند بەدەستی خۆی ئێمەی دروست کردووە، لەبەر ئەوە هەرچی یەك کەلە ئاسمان و زەوی دایە خستویەتیە بەردەستمان . خواوەند لە سورەتی رەعد ئایەتی ٣٢ و ٣٤ دا دەفەرموێت:﴿ئەو خواوەندەی کە ئاسمن و زەوی بۆتان ئەفراندووە، لە



Scanned with CamScanner

ئاسمانەوە ئاوی بۆ داباراندوون و بەروبوومی بۆ پێ گەیاندوون، دەریاو ڕووبار و ڕۆژ و مانگی خستۆتە خزمەتی ئێوەوە، شە و ڕۆژیشی خستۆتە خزمەتتانەوە و هەرچی یەکتان داواکاردبێت بۆتانی هێناوە وەئەگەر بتانەوێت نیعمەتەکانی خواوەند بژمێرن بۆتان ناکرێت، بەڕاستی مرۆڤ ستەمکارە﴾.

زۆر ئەگەری هەبوو کە خواوەند چۆن بە هەر شتێك ئەڵێت ببە ئەبێت ئەوهاشی بەتۆ بوتبایە، بەڵام خواوەند مەزنی کردوویت و بەدەستە بەخشندەکانی تۆی دروست کردووە. هەموو شتێکی بۆ ئەفراندوویت. مێشکی بۆ دروست کردوویت، ئەومێشکەی کە تۆ هەتە ئەی کوڕی گەنج خاوەنی (١٥٠) ملیار خانەیە، توانای هەیە کە (٢) ملیون زانیاری لە یەك چرکەدا لە خۆ بگرێت، ئەم خێرایی یە لە خێرایی ڕوناکی زیادترە کە ڕێژەکەی (١٨٦) هەزار میلە لە چرکەیەکدا.

گەنجەکە بەسەر سوڕماوی یەوە سەریری دەکرد. لەوکاتەدا کەسی دانا ووتی: لەلات سەیرە لە کاتێکدا خواوەند لە سورەتی ئەلدوریات ئایەتی ٢١ دا دەفەرموێت: ﴿ لە ناختاندایە ئایا نای بینن﴾.

کوڕەکەم لە جەستەت دا پارچە گۆشتێك هەیە کەپێی دەوترێت دڵ ، دڵ زیادتر لە (١٠٠) هەزار جار لێ دەدات لە ڕۆژێك دا بە بێ ئەوەی کە تۆ هەر بیری لێ بکەیتەوە، هەموو شتێك لە جەستەت دا ژیرانە لە جوڵە دایە. خواوەند گشت شتێکی خستۆتە خزمەتتەوە، هەر کاتێك بڕیارت دا پەنجەت بەرز بکەیتەوە دەتوانیت بەرزی بکەیتەوە،



Scanned with CamScanner

هەرکاتێك بڕیارت دا بجولێیت دەتوانیت بجولێیت، خواوەند فەرمانی داوە گشت شتێك بە فەرمانی تۆ بێت و بجولێت لەبەر ئەوە پێویستە وریا بیت و جیاکاری بکەیت لە نێوان کەسەکە و هەڵسوکەتی دا، چونکە ئەوکەسە باشترین دروست کراوی خواوەندە و لە ڕۆحی خۆی پێ بەخشیوە و کردوویەتی بە جێگری خۆی لەسەر زەوی ، کاتێك کەبیر لە کەسێك دەکەیتەوە تەنها بیر لەکەسەکە خۆی بکەرەوە، مرۆڤ باشترین دروست کراوی خواوندە لەبەر ئەوە هەوڵ بدە کە هەڵسوکەوتت بگوڕیت.....

گەنجەکە ووتی: من چۆن ئەتوانم هەڵسوکەوتی کەسێك بگۆڕم کە سوکایەتی پێ کردووم؟!

کەسی دانا وتی: وورد بەرەوە لەو پەیامەی کە پێت دەبەخشێت، ئەو سوکایەتی یە دەرەنجامەکە تۆ بیستووتە .... وەك سیما، جوڵەی جەستە، هەناسەدان، بەڵام ئەو هۆکاری چی بووە کە ئەوکەسەی گەیاندۆتە ئەو حاڵەتە؟

گەنجەکە وەڵامی دایەوە: بۆ نمونە کەسێك ڕۆژێ بە منی ووت ئەی بێ مێشك منیش پێم ووت: بۆچی وات پێ ووتم؟

ووتی لەبەر ئەوەی تۆ سوکایەتیت پێ کردووم... پێم ووت: من سوکایەتیم پێ نەکردوویت..... ووتی: نەخێر تۆ سوکایەتیم پێ کردووم کاتێك کە وات پێ ووتم.



Scanned with CamScanner

منیش پێم ووت: بە پێچەوانەوە، من هیچ مەبەستم نەبووە بەڵکو مەبەستم شتێکی تر بوو.... بەهەر حاڵ من داوای لێ بوردن ئەکەم....
کەسەکەش پێی ووتم: منیش داوای لێ بوردن ئەکەم.

کەسی دانا: بەمە دەوترێت ئاکاری باش. بەمە دوترێت وورد بوونەوە لەسەر پەیام ، لەبەر ئەوەی لەپشت هەر هەڵس و کەوتێکەوە پەیامێك هەیە، هەر پەیامێکیش بەهایەکی لە پشتەوەیە، هەر بەهایەکیش نیەتێکە لێ هێنراوە، نیەتیش پۆزەتیڤە هەم بۆ کەسەکە و هەم بۆ تۆش، گەر لەسەر نامەیەکە وورد بیتەوە بەهاکەیت بۆ دەردەکەوێت، گەر بەهاکەشی پێ بزانیت، نیەتەکەشی پێ دەزانیت، کاتێکیش کە مامەڵە لەگەڵ خەڵکی دا دەکەیت باشترین کەس دەبیت لە مامەڵەکردن دا. ئەم جۆرە لە پەیوەندی گرتن دەتگەیەنێت بە خاڵێکی زۆر گرنگ لە پێکەوە گونجان دا ، کاتێکیش کە دەگەیتە ئەم ئاستە دڵنیابە کە خواوەند زیادو زیادتر پیرۆزت دەکات، لەبەر ئەوەی گەر ئەو کەسەی کەلەبەر دەمت دایە زۆر تورە بوو ئەوا تۆ لە ڕێی دانایی خۆتەوە یارمەتی دەدەیت کەلەو حاڵەتە ڕزگاری بیت، بشزانە کە تەنها ئەو نیە کە ئارامی گرتووە بەڵکو تۆش ئارامت گرتووە. کوڕی خۆم هەر لەم ساتەوە ئامۆژگاریت دەکەم کە لەم پەیامە وورد بیتەوە، لەسەر هەڵسوکەت وورد مەبەرەوە لەبەر ئەوەی هەر هەڵسوکەووتێك هەڵگری پەیامێکە، کاتێك کە لە پەیامەکە وورد دەبیتەوە پەیوەندی دروست دەبێت، بەڵام گەر لە هەڵسوکەوتەکە وورد بیتەوە ئەو کاتە کار دانەوە دروست دەبێت، تا ئەو کاتەش کە کاردانەوە هەبێت تۆ بەرگری لە خۆت دەکەیت، تۆش پێویستت بەوە نی یە کە بەرگری لە خۆت بکەیت



Scanned with CamScanner

تەنها تۆ پەیوەندی دەکەیت و بۆ چوونی خۆت لە بوارێک دا دەدەیت، بۆ بۆچونی خۆت لەسەر کەسێکی دیاریی کراو نادەیت، کاتێک کە کێشەیەکی قوڵت هەیە پێویستە لەسەر ئەوە بوەستیت کە مرۆڤ باشترین دروست کراوی خواوەندە.

هەمیشەش لە خاڵی هاوبەشەوە دەست پێ بکە، هەرگیزا و هەرگیزیش لە خاڵی جیاوازەوە لەگەڵ کەس دا دەست پێ مەکە. لەبەر ئەوی هەر ئەوەندەی کەلە خاڵی جیاوازی یەوە دەستت پی کرد، کەسەکە دەست بە جێ دەست دەکات بە بەرگری کردن لە خۆی، لێدانەکانی دڵی زیاد دەکات و ڕیتمی هەناسەدانی زیاد دەکات، پلەی گەرمای جەستەی بەرز دەبێتەوە، خوێنی دەکوڵێت و بەم شێوەیە .... لەم کاتانەدا ڕێژەیەکی زۆری ئەدرینالین دەڕژێتە ناو ماسولکەکانەوە بۆ ئەوی کەسەکە ئامادەبکات بۆ بەرگری کردن لە خۆی. گەر لەم کاتەدا بتەوێت کەسەکە بگەڕێنیتەوە شوێنی خۆی کات و ووزەیەکی زۆرت لێ دەبات لەبەر ئەوە هەمیشە لە خاڵی پێک هاتنەوە دەست پێ بکە ئەمەش بەرزترین ئاستی پەیوەندی گرتنە کە دەمانەوێت پێی بگەین.

گەنجەکە پرسی: گەر لەگەڵ کەسێک دا پێک نەهاتم چی بکەم؟

کەسی دانا وەڵامی دایەوە: شتێکی زۆر گرنگ ئەنجام بدە کە بریتی یە لە هاوسۆزی .

گەنجەکە پرسی: هاوسۆزی چی ئەگەیەنێت؟



Scanned with CamScanner

## هاوسۆزی

**گەنجەکە پرسی: هاوسۆزی چی یە؟**

کەسی دانا ووتی: من باش گوێم لێتە و باشیش ئەتبینم، باشیش هەستت پێ دەکەم دواتر بە دیاری کراوی پرسیارت لێ دەکەم، کاتێك کە هاوسۆز دەبین لەگەڵ یەکدا، لەیەك شوێندا دەمێنینەوە. بەڵام گەر هاوسۆزی نەبێت هەر یەك لە ئێمە دەبێتە دوژمنی ئەوی دی، تۆ لە رێی هاوسۆزی یەوە دەتوانیت بەردەوام بیت لە پەیوەندی کردن بە ئەوانی دیەوە، لە رێی بیرکدنەوە و وورد بوونەوەوە کێشەکان چارەسەر دەبن، لە ئاکاردا زۆر گرنگە کە باش گوێ لەبەرامبەرەکەت بگریت، رەنگە هەر ئەوە بێت کە خواوەند یەك دەم دوو گوێی پێ بەخشیوین بۆ ئەوەی کە زیادتر ببیستین و کەمتر قسە بکەین (باشترین قسە ئەوەیە کە کەم بێت و پڕ مانا بێت)، تۆ تا باشتر گوێ بگریت باشتر تێ ئەگەیت و باشتر دەتوانیت هەڵسەنگاندن بکەیت، کاتێکیش کە قسە دەکەیت باشتر لە قسەکانی خۆشت دەگەیت، تۆ لە هەموو حاڵەتەکاندا لەقسەی خۆت دەگەیت، کەواتە کێ سوود دەکات؟

گەنجەکە ووتی: من لە مەبەستت تێ گەیشتم من زیادتر گوێ دەگرم لە چاو قسەکردن دا بەڵام مەبەستت لەباش گوێ دان چی یە؟

کەسی دانا: تۆ بە گوێچکە، گوێ دەگریت و بە دڵ گوێ دەدەیت، تۆ لێرەدا دەبێت بە بەردەوامی بەکەسەکە بڵێیت: ئەوەی کە تۆ ئێستا ووت زۆر جوانە، من لام پڕ بایەخە بزانم تۆ چۆن گەیشتیتە ئەو

دەرەنجامە..... بەم شێوەیە تۆ کارێك دەکەیت کە بەرامبەرەکەت زیادتر لێت نزیك بێتەوە و زیادتر بۆت بدوێت لەبەر ئەوەی تۆ گوێ لێ دەگریت، گوێ گرتن گرنگی پێ دان دروست دەکات، گرنگی پی دانیش خۆشەویستی دروست دەکات، ئەوکاتەش کە خۆشەویستی دروست بوو گوێ پێ دان بە دڵ دەبێت و گوێ گرتنیش بە گوێ...

گەنجەکە ووتی: زۆرباشە ، بۆ یەکەمین جار کە ئەزانم جیاوازی هەیە لە نێوان گوی پی دان و گوی گرتن دا، دواتر ووتی: چی تر هەیە؟

کەسی دانا: من ئێستا زۆر دڵم پێت خۆشە، لەبەر ئەوەی حەز بە زانینێکی زۆرت تێدا دروست بووە، ئەتەوێت زیاد و زیادتر فێر بیت، ئەمەش رێگای ئەو کەسانەیە کە دەیانەوێت ببن بە مرۆڤی باڵا، تۆ ئەتەوێت فێربیت منیش ئەمەت لە قۆناغە پێشکەوتووەکانی دواتر دا پێشکەشت دەکەم....

گەنجە کە ووتی: ئەی دوای ئەوە:

کەسی دانا ووتی: پێ کەنین....

## پێ کەنین

گەنجەکە ووتی: پی کەنین؟

کەسی دانا ووتی: بێ گومان ، ووتەی پەیامبەرت لە یادە کە دەفەرموێت (پێ کەنین بە ڕووی براکەت دا چاکەیە).



Scanned with CamScanner

دواتر ووتی: ئایا ئەزانیت کەلە دەم و چاوت دا (٨٠) ماسولکە هەیە، تەنها بە پێکەنین تۆ (١٤) ماسولکە بەکار دەهێنیت، هەر یەك لە ماسولکەکانی دەم و چاویش بەستراوەتەوە بە خانە گەلێك لە مێشك دا، خانەکانی ناو مێشکیش ئیسراحەت بە جەستە دەدات، کاتێك کە پێ دەکەنین دەمو چاو ئیسراحەت دەکات و خاو دەبێتەوە، بەم شێوەیەش مێشکیش ئیسراحەت دەکات، کاتێکیش کە مێشك ئیسراحەت دەکات تەواوی جەستەش ئیسراحەت دەکات و ڕێژەی ئەدرنالین لە خوێندا زیاد دەکات.

گەنجەکە پرسی: ئەدرنالین چی یە؟

کەسی دانا: ئەدرنالین ئەو مادەیەیە کە توانای جەستە زیاد دەکات بۆ بەرگری کردنی لە خۆی، ئەم کارەشی تەنها دەرنجامی پی'کەنین نیە، بەڵام پێ کەنین زوو بڵاو دەبێتەوە، لەبەر ئەوەی کەسی بەرامبەرت کاتێك کە دەبینێت زەردەخەنەت لەسەر لێوە و ئاسوودەیت، ئەویش بە هەمان شێوە زەردەخەنە ئەیگرێ و ئاسودە دەبێت.

گەنجەکە ووتی: باشە گەرهاتوو پێ نەکەنی بە ڕوومدا؟

کەسی دانا: تۆ هاوسۆزی لەگەڵ دا بکە و فەرماندەیی ئەوحاڵەتە بکە....

گەنجەکە ووتی: فەرماندەیی کردن مانایی چی یە؟

کەسی دانا: پێ کەنین بڵاو دەبێتەوە، تەنها بە چەند جارێکی پێ کەنین ئەبینیت کە کەسەکەش لەگەڵتدا دەست بەپێ کەنین دەکات،

کاتێکیش کە کەسی بەرامبەر پێ دەکەنێت، ئەبینیت هەر بەشێك لە ناوجەستەی بانگهێشت دەکات، لەبەر ئەوەی بەپێ کەنینت وات لێ کرد ئەویش پێ بکەنێت، بەم شێوەیە هەر بەشێك لە جەستە خاودەبێتەوە وئاسودە دەبێت، لەبەر ئەوە تۆ چاکەت لەگشت بەشێکی جەستەیەوە دەستگیر دەبێت، تۆ چاکەت لە جگەرییەوە دەستگیر دەبێت .... لەسپڵەوە دەستگیر دەبێت، تۆ لە گورچیلەکانیەوە چاکەت دەستگیر دەبێت، بەم شێوەیە تۆ لە هەموو شوێنێکەوە چاکەت دەستگیر دەبێت، لەلای زانا چینی یەکان بەم حاڵەتە دەوترێت ( کەنینی ناوەکی)، کاتێك کە زاناکان لەم جۆرە کەنینەیان کۆڵیەوە بۆیان دەرکەوت کە ئەم جۆرە کەنینە لەناو جەستەدا جۆرێك ترشەڵۆك دروست دەکات کەپێی دەوترێت (جليكوجين)، ئەم ترشەڵۆکە وەك هەنگوینی ڕەش وایە ، بیهێنەبەر چاوت کاتێك کە بەپێکەنینت ئەم مادەیە لە جەستەت دا دروست دەبێت، کاتێکیش کە دەبیتە هۆکار بۆ ئەوەی بەرامبەرەکەت پێ بکەنێت، ئەم ترشەڵۆکە لە ناو جەستەی دا دروست دەبێت. بەم شێوەیە ئەو چاکەیەی کە دەستگیرت دەبێت تەنها لەبەر ئەوە نی یە کە تۆ بەڕووی دا پێ ئەکەنیت، بەڵکو هەر بەشێك لە بەشەکانی جەستەی بەرامبەرەکەت چاکەت ئاڕاستە دەکات لەبەر ئەوەی ئاسودەیە، کاتێکیش کە ئاسودە دەبێت باشتر دەبێت، تەندروستی باشتر دەبێت و دواجار لەلای خواوەند بۆت ئەپارێتەوە.

گەنجەکە ووتی: من زۆر خۆشحاڵم بە بوونم لێرە، زۆریش خۆش حاڵم لەبەر ئەوەی پشوو درێژ بووم تا بگەم بە ئێرە....

کەسی دانا: بۆت دەرکەوت چۆنە کاتێک کە پابەند دەبیت بەشێک بەرچاوت ڕوون دەبێت و پشوو درێژ دەبیت، سەرجەمی ئەم شتانەش لەلایەن خواوەندەوە پێمان بەخشراوە، لەبەر ئەوە ئەگەری ئەوە هەبوو کە بێزاربیت، بەڵام ئەوە خواوەند بوو کە ئاراستەی کردی و ئەوپەیامەی پێدای کە بەرچاوت ڕوون بێت و گوێ بگریت و بزانیت ڕێگای باڵابوون پەیوەندی بە مادەوە نی یە، تا ئەوکاتەش کە تۆ دەتەوێت بگەیت بەو ڕێگەیە دڵنیابە کە ئەو ڕێگەیە سەرکەوتووت دەکات لەم دنیا و لەودنیادا، لەبەر ئەوە گەر سەرکەوتن تەنها لەم دنیایە دا بوایە ئەوە بە دەست هێنانی کۆتایی پێ دەهات و لەکاتی بەدەست هێنانی پشیدا هەست بە خۆشی نەدەکرد، ڕەنگە کەمێک هەست بە خۆشی بکەیت، بەڵام هەست بە ئاسوودەیی ڕاستەقینە ناکەیت، لەبەر ئەوەی پارە ناتوانێت تەندروستی ببەخشێت، هەروەها پارە ناتوانێت کە ئاسوودەیت پێ ببەخشێت. بەڵام سەرجەمی ئەم کارانە بەپەیوەندی کردنت لەگەڵ خواوەند دا دەی دۆزیتەوە، خواوەندیش ئاراستەت دەکات، دەرووت لێ دەکاتەوە، لەهەر گرفتێک دا یارمەتیت دەدات. هەمیشە ئەوەت لەیادبێت کە بڵێت: سوپاس بۆ خوا، گەرهاتوو هەڵنوتیت پێ بکەنە، بەم شێوەیە تۆ لە هاوکێشەکە دەگەیت، لەبەر ئەوەی کە تۆ هەمیشە ڕووت لە خوایە خواوەندیش زیادتر

لەوەی کە تۆ چاوەنی دەکەیت دەرووت لێ دەکاتەوە ڕەنگە لە ژیانت دا کێشە گەلێکی زۆرت توش بێت و چاوەڕوانی چارەسەربکەیت، بەڵام کاتێك کە بە وێستگەکانی ژیاندا تێ دەپەڕیت و ئاوڕ لە ڕابردوو دەدەیتەوە دەبینیت ئەوەی کە ڕووی داوە باشترین شت بووە لە ژیانت دا، لەبەر ئەوەی گەر وانەبوایە هەرگیز تۆ نەدەبوویتە هاوسەری فلان کەس کە باشترینە، گەر وانەبوایە تۆ نەت دەتوانی ئەوکارە باشەت دەست بکەوێت و سەرکەوتنت بەدەست نەدەهێناو، نەدەهاتیتە سەر ڕێگەی باڵابوون....

گەنجەکە ووتی: من ئێستا ئەو ڕێگەیە دەناسم ، من پێشتر پێم وابوو کە ئەو ڕێگەیە بریتی یە لەوەی کە کەسێك هەندێك ئامۆژگاریم بکات.

کەسی دانا: ئەی کوڕی گەنج.... ئامۆژگاری یەکان لەناو کتێب دا هەن، هەروەها لە دەوروبەرتدا هەن، بەڵام دانایی لە زەردەخەنەیی منداڵێك دا بەدی دەکرێت، مەزنی و جوانی دروست کراوی خواوەند لە باڵی پەپولەیەك دا بەدی دەکرێت، لە جریوەی پاسارییە کا بەدی دەکرێت، لە جوانی ئاسماندا بەدی دەکرێت، لە شەپۆلێکی ئارام و دەنگێکی جواندا بەدی دەکرێت، یاخود لەو شنە بایەی کەبەر گۆناکانت دەکەوێت، ئاسوودەیی ڕاستەقینە ئەمەیە.

گەنجەکە ووتی: ئێستا من هەست بە جوانی ئەم ڕێگایە دەکەم، هەست ئەکەم ناتوانم چیتر چاوەڕوانی ڕێکردن بکەم لەسەر ئەم ڕێگەیە.

کەسی دانا: شتێکی زۆر گرنگت لەیاد کرد،

گەنجەکە ووتی: داوای لێ بوردن ئەکەم.

کەسی دانا : بۆچی داوای لێ بوردن ئەکەیت؟

گەنجەکە ووتی: لەبەر ئەوەی من ئێستا لەسەر ئەو ڕێگەیەم.

بەتامەزرۆییەکی زۆرەوە گەنجەکە سەیری کەسی دانای کرد و ووتی: من زیاد و زیادترم ئەوێت.

کەسی دانا سەیرێکی کرد و ووتی: لێی خۆش بە.

## لێ خۆشبوون

گەنجەکە ووتی: لێ خۆشبوون چی ئەگەیەنێت؟

کەسی دانا: لەکاتی بەهێزی دا لێ خۆش بە، هەرکاتێك بینیت کە زۆرت بەسەر کەسێك دا دەشکێت، ئەوە بزانە کە خواوەند تاقیت دەکاتەوە، تا ئەوکاتەی کە پەیوەندیت بە خواوەندەوە هەیە، خۆشویستن لە ڕێی خواوەندا دەکەیت و بەڕەوشێکی باشەوە مامەڵە لەگەڵ خەڵکی دا دەکەیت، ئەوا تۆ بەرەو ڕوو دەبیتەوە، ئەگەر لێ خۆشبیت خواوەند زۆر زیادتر لەوەی کە تۆ داوای دەکەیت پێت دەبەخشیت لەبەر ئەوەی تۆ تاقی کراویتەتەوە، هەر مرۆڤێکیش لەم دنیایە دا، ڕۆشنبیربێت یاخود ناڕۆشنبیر خوێندەواربێت یاخود نەخوێندار، دەوڵەمەند یاخود هەژار، لەخانەوادەیەکی ناسراو یاخود نەناسراو، خاوەن پلەو پایە بێت یاخود خاوەن هیچ پلە و پایەیەك



Scanned with CamScanner

نەبێت، سەرجەم ئەم کەسانە تاقی دەکرێنەوە و ڕووبەڕوو دەبنەوە لەگەڵ تەنگ و چەڵەمەکاندا، لەڕێی ڕووبەڕوو بونەوەیە کە ئاگایی مرۆڤ بەدیار دەکوێت، کاتێك کە مرۆڤ دەکەوێتە ناو هەڵوێستێکی سەختەوە زۆرباش دەزانێت کە چۆن هەڵوێست وەربگرێت، لەبەر ئەوە پەندێکی عەرەبی هەیە کە دەڵێت: (دەسەلات بە مرۆڤ ببەخشە تابزانێت ئاکاری چۆنە). لەبەر ئەوەی هەر ئەوەندەی کە مرۆڤ دەگاتە دەسەلات ئاکارەکەی دەردەکەوێت، مەرجیش نیە ئەو دەسەلاتە پلەوپایەیەکی گەورەبێت، ڕەنگە منداڵێکی بچکۆلەی بەتوانا بێت، کەڕەنگە لە کەسێکی لەخۆی گەورەتریش بە تواناتربێت، گرنگ ئەوەیە کە بزانیت چۆن دەسەلات بەکاردەهێنیت، وە چۆن خۆت لە خواوەند نزیکتر دەکەیتەوە، تۆ خۆت دەزانیت کە لێبووردنی تەواوەتی و زەینی سۆزداری و زەینی شیکاری دەبێت گونجاوبن لەگەڵ یەکتردا بارو دۆخ هەرچۆنێك بێت تۆ نەبێت ببورێت لەبەر ئەوەی لەڕێی خواوەند و بۆ خواوەندە، ئەشبێت ئاگاداربیت چونکە ڕەنگە دەروازە یەکیش لە دەروازەکانی ئەهریمەنیش بەڕوتدا بکرێتەوە، بۆ نمونە کاتێك کە توڕەیت دەست بەجێ ئەهریمەن لەو دەروازەیەوە دێتە ژوورەوە و پێت دەڵێت: ئەوکەسە ڕقی لەتۆیە، تۆش ڕقت لێی بێت.... سەرەتا بە گومان لەگەڵت دا دەست پێ دەکات، گومان لە خۆت دەکەیت تا ئەو کاتەش کە گومان لەخۆت دەکەیت، گومان لەگشت کەسێك دەکەیت، گەر گومانیش لە خەڵکی بکەیت پەیەندیت بە خواوەندە



Scanned with CamScanner

دەپچڕێت. گەرئەهریمەن بزانێت کەتۆ لەم دەروازەیەوە نزیکیت بەردەوام لەم دەروازەیەوە دێتە ژوورەوە و دەتوانێت بەئاسانی تێکت بشکێنێت ، پێویستە ئەوەت لە یادبێت کە ئەم ساتە ڕەنگە دواساتی ژیانت بێت، ئەم خاڵەمان سەرەتا باس کرد لەیادتە؟

گەنجەکە ووتی: بەڵێ.

کەسی دانا: گەر ئەم ساتە دواساتی ژیانت بێت پەیوەندی بە خواوەندەوە بکە ئەمە هەلێکە بۆ ئەوەی لێ خۆشببیت و زیادتر لە خواوەندەوە نزیك ببیت، گەر کەوتیتە هەڵوێستێکەوە بڵێ: ئەی خوایە لەبەر تۆ لێی خۆش بووم، ئەی خوایە لەبەر تۆ لێی خۆشبووم، ئەو کەسە هەرچی یەکی لەگەڵ دا کردیت لێی خۆشبە.

گەنجە کە پرسی: مەبەستت ئەوەیە کە گێلانە لەگەڵ خەڵکی دا مامەڵە بکەم ، بۆ ئەوەی هەرکاتێك کە خەڵەتاندیانم من بیانبوورم.

کەسی دانا: نەخێر کەس قسەی وای نەکردووە بەڵام کاتێك کە تۆ بڕیار دەدەیت کە لە کەسێك خۆشبیت کۆی ووزەت ئاڕاستەی سەرکەوتنت دەکەیت. بەڵام گەر بڕیار بدەیت شەڕی جیهان بکەیت لەم کاتەدا دەبینیت کەهیچ کام لە ئارەزووەکانت نەهێناوەتە دی لەبەر ئەوەی کەتۆ ووزەی خۆت لەو شەڕەدا بەفیڕۆ داوە کەخۆت دروستت کردووە. هەمیشە بە دوای خاڵی گونجاودا بگەڕێ، هەمیشە بە دوای ئاکاردا بگەڕێ، هەمیشە هەوڵبدە کە پەی بەو خاڵە ببەیت کە هۆکارە بۆ جیاوازی.



Scanned with CamScanner

گەنجەکە ووتی: ڕەنگە لەگەڵ باوکم و دایکم بۆچوونی جیاوازم هەبێت.

کەسی دانا: ئەوان بە باشترین شێوە تۆیان پەروەردە کردوە، خواوەند لە سورەتی ئەلئەسرا ئایەتی ( ٢٣) دا ئاگادارت دەکاتەوە کە: ﴿خواوەند فەرمانی داوە کە جگە لەو کەسی دیکە مەپەرستن و باش بن لەگەڵ دایك و باوکتاندا﴾.

ئەوە ئەوانن کەشەونخونیان کردووە و ماندوو بوون بە پەروەردە کردنتەوە، لەبەر ئەوە کارێك مەکە هۆکار بێت بۆ نارەحەت کردنیان.

گەنجەکە وتی: تەنانەت گەر ڕەقیش بن!

کەسی دانا: ئەوان چۆن ئەتوانن لەگەڵ تۆ ڕەق بن لە کاتێکا تۆ ئەزیزترین کەسیانی؟! ئەمە ڕەقی نی یە، تۆ جارێ بە ئارامی بیر بکەرەوە، تۆ چی ئەکەیت؟!

گەنجەکە وتی: پێم وابێ تۆ ڕاست دەکەیت، من زۆرجار هەڵەی گەورە ئەکەم، بۆ نمونە زۆرجار کەلەماڵ دەردەچم تا درەنگانێ ناگەڕێمەوە، هەروەها بە داخیشەوە من ئێستا جگەرە ئەکێشم.

کەسی دانا: گرنگترین شت کە دەبێت هەمان بێت ئەوەیە کە خاوەن ئاکارێکی باش بین .

گەنجەکە ووتی: ڕاستە، ئەگەر چێژ دوای بەدەست هێنانی دوایی بێت، ئەوا من وازی لێ ئەهێنم، لەبەر ئەوەی ئەوکەسەی کە شتێك لە



Scanned with CamScanner

پێناو خواوەندا واز لێ بهێنێ خواوەند بەشتێکی باشتر قەرەبووی دەکاتەوە لەبەر ئەوەی هەڵسوکەوت زۆر گرنگە.

کەسی دانا پرسی: ئەکێشیت؟

گەنجەکە ووتی: ئەم کێشا.... لێرەدا گەنجەکە پێکەنی پێ کەنینێك کە زیادتر ئەگەڕایەوە بۆ ئەو بڕیارەی کە دابووی.

کەسی دانا: چەندە من بەم بڕیارە دڵخۆشم لەبەر ئەوەی نیەت پاکی بەرامبەر بەخواوەند تەنها کۆمەکی خواوەندی لێ دەکەوێتەوە ... تا ئەو کاتەش کەتۆ وازت لە جگەرە کێشان هێناوە دڵنیابە کە هەر سەختی یەك بێتە سەر ڕێت خواوەند ئەو هێزو توانایەت ئەداتێ کە دڵسۆز بیت بەرامبەر بە بڕیارەکەت. لەبەر ئەوە ئەی کوڕی گەنج هەرچەندە ڕووبەڕوو بوونەوە سەخت بێت، پشت بە خواوەند ببەستەو دڵنیابە کە کۆمەکت دەکات و هیچ کات بە تەنها بەجێت ناهێڵێت. ئێستا بڵێ: ئەی خواوەند بڕیارم داوە کە دوور بکەومەوە لە گشت هەڵسوکەووتێکی نێگەتیڤانە، نیەتم هێناوە کە لەوپەڕی هێزدا لێخۆش بوونم هەبێت. نیەتم هێناوە ئەو کەسانەش ببەخشم کەستەمیان لێ کردووم، نیەتم هێناوە ئەی خواوەند زیادتر لێت نزیك ببمەوە، لەبەر ئەوەی من ئێستا لەوهاوکێشە کە گەیشتووم کە ڕەنگە ئەم ساتە دواهەمین ساتی ژیانم بێت، لەبەر ئەوە بڕیارم دا ئەم ساتەم بۆتۆ بێت ئەی خواوەند.



Scanned with CamScanner

کەسی دانا پێکەنی، ووتی: دڵنیابە لەوەی کە تا بەم شێوەیە بیربکەیتەوە خواوەند زیادتر لەوەی کە پێش بینی دەکەیت پێت دەبەخشێت.

گەنجەکە ووتی: من بەڕاستی خۆشحاڵم بەوەی کە فێری بووم من هاوڕێ یەکم بوو، زۆر تورەی کردم، بەڵام ئێستا بڕیارم دا کەبی بەخشم بەلاّم تائێستا نەم توانیوەوە ئەو کارە بکەم.

کەسی دانا: کواتە تائێستا نەت بەخشیوە.

دواتر پرسی: توانات بەسەر هاوڕێ کەت دا دەشکێت؟

گەنجەکە: بەڵێ

کەسی دانا : چۆن توانات بەسەری دا دەشکێت؟

گەنجەکە وەلاّمی دایەوە: لەڕووی جەستەی یەوە لەڕووی کۆمەلاّیەتیشەوە، لەبەر ئەوی من پەیوەندی کۆمەلاّیەتیم لەوزیادترە، لەڕووی دارایشەوە لەو بەهێزترم. بگرە کەسانێك دەناسم کە دەتوانن تێکی بشکێنێنن.

کەسی دانا: هیچ کەسێك بەبێ ڕەزامەندی خواوەند ناتوانێت کەسێکی تر تێك بشکێنێت لەوانەشە ئەوکارە تەڵەیەك بێت بۆت و دووچار بەگرفتاریت بکات، ئێستا بڕیارت دا کە لێی خۆش بیت، ئایا ئێستاش ناتوانیت؟

گەنجەکە ووتی: لێی خۆشبووم.

کەسی دانا: دوعا بۆ هاوڕێکەت بکە.



Scanned with CamScanner

گەنجەکەووتی: چۆن دوعای بۆ بکەم؟

کەسی دانا ووتی: دووعای بۆ بکە خواوەند پارمەتی بدات و دەرووی لێ بکاتەوە و بەهێزتری بکات. تۆ ئەتوانیت سوود لە کەسێك وەربگریت کەلەگەڵی دا لە ململانێ دایت، لەو ڕێگەیەوە چاکە بۆخۆت تۆمار دەکەیت، ئەمە ئەو هاوکێشە درووستەیە، لە نیشانەکانی لێ خۆشبوونیش لەکاتی هێزدا ئەوە کە لە خوا بپاڕێتەوە کە چۆن تۆی ڕێنوێنی کردووە ئاوەهاش ئەو ڕێنوێنی بکات. ئەو ئەگەرە بوونی هەبوو کە تۆ هەر بەم شێوەیە بمێنیتەوە و ئەو ڕق و کینەیە لەگەڵ خۆت دا هەڵبگریت و ئەو گومانەش کە خواوەند نەهی لێ کردووە لەگەڵ خۆت دا هەڵگریت، ڕەنگە ئەهریمەنیش هەر لەو دەروازانەوە لێت بێتە ژوورەوە، بەڵام خواوەند دەرووی لێ کردیتەوە، لەبەر ئەوە تۆش لە خواوەند بپاڕێرەوە کە بەهەمان شێوە دەرووش لە ئەو بکاتەوە بیکاتە بەندە دروستەکانی، ئەو بەندانەی کە پەیامبەر لەبارەیانەوە دەفەرمێ: ﴿ زۆر کەس هەن کە کلیلی خێریان بەدەستەوەیە و زۆر کەسیش هەنکە کلیلی شەڕ یان بەدەستەوەیە، خۆش بەحاڵی ئەو کەسانەی کە خواوەند کلیلی خێر و کاری چاکەی خستۆتە دەستیانە وە و وەی بەحاڵی ئەو کەسانەش کە خواوەند کلیلی خراپەی خستۆتە دەستیانەوە﴾ "بەریوایەتی ئبن ماجە".

تاقی بکەرەوە، بەیاری یەزدانیش خۆت دەبینیتەوە کەیاری خەڵکی دەدەیت و زیادتر لە خواوەند نزیك ئەبیتەوە، بەیاری یەزدانیش دەبیتە مژدەهێنی کاری چاکە.

گەنجەکە ووتی: پێت وایە کە من بتوانم مژدەی کاری چاکە بدەم؟

کەسی دانا: تائەو کاتەی کە تۆ خوازیاریت کە ببیت بە مرۆڤی باڵا ئەوا تۆ لەسەر ڕێگەی گەیشتن بە پەروەردگاریت، دڵنیاش بە کوڕی گەنج تائەو کاتەی لەسەر ئەم ڕێگەیە بەردەوام بیت، دەگەیت بە خواوەندی خۆت، سەختیت دێتە ڕێ و ماندوو دەبیت، ژیان سەخت دێتە پێش چاووت، نەخۆش دەکەویت، کەس لە دەوروبەری خۆت بەدی ناکەیت، ڕەنگە هەندێ جار هەست بە تەنیایی بکەیت، زۆر هەست بە زلم و زۆری خەڵك دەکەیت، سەرجەم ئەم کارانە ڕێی تێ دەچێت کە بێتە سەر ڕێت، بەڵام دواجار ئەوەت لەبیر بێت کە دوای شەو ڕۆژ دێت، دوای ماندووبوونیش ئیسراحەت کردن هەر کەوتنێکیش بە دوای دا سەرکەوتن دێت. خواوەند لە سورەتی بەقەرە ئایەتی ٢١٦ دا دەفەرموێت: ﴿ڕەنگە حەز بەشتێك نەکەیت و ئەوشتەش بۆ ئێە باش بێت، ڕەنگە حەز بەشتێك بکەن و ئەو شتەش بۆ ئێوە خراپ بێت، خواوەند ئەزانێت و ئێوە نازانن﴾. لەبەر ئەوە ئەی کوڕی گەنج لە هەرکوێ یەك بوویت لەخوا بترسە.



Scanned with CamScanner

گەنجەکە ووتی: گەورەم.... کۆی زێڕی دنیا هێندەی ئەو ووتانەی تۆ بەهای نی یە. گەر خەڵکی بەم قسانە بزانن، کەس لەماڵ نەدەمایەوە و تەمبەڵیان نەدەکرد...

کەسی دانا ووتی: هەر لەبەر ئەوەیە کە خواوەند تۆی دروست کردووە، تا تۆ ڕێگەی باڵابوون بگریتە بەر و ماندوو بیت لەو ڕێگەیەدا ئەوە نیشانەی ئەوەیە کەتۆ لەلایەن خواوەندەوە هەڵبژێردراویت. گەر تۆ ئەم ڕێگەیەت هەڵنەبژاردایە هەروەك خۆت دەمایتەوە و نەدەگۆڕایت و بەردەوام تووڕە دەبوویت و ئازارت دەچێشت و شەڕت لەگەڵ تەواوی گەردووندا دەکرد، هەستت بە ستەم و تاریکی دەکرد و هەستت دەکرد کە کەس تۆی خۆش ناوێت، بەڵام خواوەند تۆی هەڵبژارد و پاکی کردیتەوە. تۆی هێنا بۆ ئێرە بۆئەوەی پاکت بکاتەوە. لەبەر ئەوە گەر تۆ ئەوەی کە فێری دەبیت تەنها بۆ خۆتت بەکار هێنا، زۆر لێت ئەقەومێت، تا زیادتر ببەخشیت، زیاد خواوەند ئاگای لێت دەبێت.

گەنجەکە ووتی: بەم شێوەیە گەیشتینە کۆتایی؟

کەسی دانا ووتی: نەخێر، لەبەر ئەوەی دەبێت وەك کەسێکی پێشەنگ ژیرانە و ڕوون قسە بکەیت.

گەنجەکە ووتی: مەبەستت چی یە؟

کەسی دانا ووتی: خواوەند دروستی کردوین کەبە وێنەوە بیر بکەینەوە....

گەنجەکە پرسی: چۆن لەرێی وێنەوە بیر بکەینەوە؟!

کەسی دانا پرسی: بابزانین خواوەند چی پێ بەخشیوین لە چاو و گوێ و سوودمەندییەکانی، پێویستە ئێمە گوێ لە ووشە و ماناکەی بگرین.

گەنجکە پرسی: چۆن ماناکەی بزانم؟

کەسی دانا وەڵامی دایەوە: خواوەند کاتی باوە ئادەمی دروست کرد هەمووشتێکی فێر کرد. خواوەند لە سورەتی بقرە ئایەتی ٣١ دا دەفەرموێت:﴿ئادەمی فێری سەرجەم ناوەکان کرد و دواتر نیشانی فریشتەکانی دا﴾.

خواوەند توانای تێگەیشتنی ووشەی فێر کردووین، کەواتە ئێمە تێ گەیشتنمان هەیە بۆ مانا، ناویشمان ناوە لە تێگەیشتنەکانی خۆمان بۆ ماناکان، ئیدراکیش هۆی بونی مێشکە، خواوەندیش مرۆڤی دروست کردووە بۆئەوەی دەرك بکات، بۆ ئەوەش کەدرك بکات پێویستە مێشك کاربکات و پەی بە مەزنی خواوەند ببات.

گەنجەکە پرسی : ئەی چۆن ژیرانە قسە بکەم؟

کەسی دانا وەڵامی دایەوە: واتە بە دیاری کراوی قسە بکەیت، لەبەر ئەوەی هەر وشەیەك هاوکات لەگەڵ وێنەیەك دا دروست دەبێت، هەر وێنەیەکیش مانایەکی هەیە کەلە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەگۆڕێ، کاتێك کە قسە ئەکەیت ڕەنگە زۆر بڵێیت و هیچی منای نەبێت، هەندێ کەس زۆر دەڵێن و هەندێکیش کەم دەڵێن.



Scanned with CamScanner

گەنجەکە پرسی: بەڵێ ئەوەباش ئەزانم، هەن دەڵێن من ئەوکارەت بۆ ڕێك دەخەم کەسێکی تریش دەڵێت ئاگاداربەو تادوای...

کەسی دانا: ڕاستە زۆر لەو قسانەی کە دەیڵێن هیچ پێویست نی یە، زۆربەی ئەو کێشانەش کەلەم دنیایەدا بوونی هەیە بێ هوودەیە و پێویست ناکات. گەر بێت و تەنها جەخت لەسەر قسەکردن بکەین و دیاری بکەین کەچی بوترێت و چی نەوترێت، ڕستەکان تەواو دەبن و ئەوکاتەش کەسەکە پەیوەندی دەبێت بەوشتەی کەدەیڵێیت، ئەوکاتە ڕستەکە تەواو دەبێت و ئەوکاتە ئەوکەسی گوێت لێ ئەگرێت ئەتوانێت بە تەواوەتی وەڵامت باتەوە، کەواتە بەدیاری کراوی قسە بکە، ژیرانە بدوێ و زیاد ببیستە تا ئاخاوتن..سەبارەت بەو شتەی کە باسی لێوە دەکەیت زانیاری کۆبکەرەوە، کاتێکیش کە قسە دەکەیت زیادتر لەسەر پەیامەکە وورد بەرەوە نەوەك لەسەر کەسەکە. بەکەسی قسەکەر دا هەڵبدەو دواجار بە پەیامێکی پۆزەتیڤانە دوایی بە قسەکانت بهێنە.

گەنجەکە پرسی: بۆچی؟

کەسی دانا: لەبەر ئەوەی مێشکی مرۆڤ لەسەر دواپەیام کار دەکات، گەر لەم فەرموودەیەی خواوەند لە سورەتی بەقەرە ئایەتی ١٥٥ — ١٥٧ ووردبیتەوە سەرت دەسوڕمێت : ﴿مزگێنی بدە بە کەسە پشوو درێژەکان، ئەو کەسانەی کە گەربێت و تووشی کۆستێك هاتن دەڵێن: ئێمە لە خواین و هەر بۆلای خواش دەگەڕێینەوە، ئەو جۆرە کەسانە



Scanned with CamScanner

خوا ڕەحمەت دەبارێنێت بەسەریاندا و هەر ئەوانیش ڕێگای دروستیان گرتۆتە بەر﴾.

خواوەند دەیەوێت ئاگادارت بکاتەوە لەسەر دوا ئەزموون. مێشکیش لەسەر دوا ئەزمون کاردەکات. دواتر ووتی: تۆ ئێستا قسە لەگەڵ من ئەکەیت لە چرکەیەکدا هەوڵ بدە هەر شتێك لە قسەکانم بەیاد بهێنیتەوە .

گەنجەکە ووتی: ئێستا ئەی هێنمەوە یادو پێت ئەڵێم...

کەسی دانا ووتی: نەخێر بەڵکو لە کاتی قسە کردنی مندا زیادتر تۆ لەسەر چی ووردە دەبوویتەوە؟

گەنجەکە وەڵامی دایەوە: لەسەر دواهەمین شتێك کە وتت.

کەسی دانا ووتی: مێشك تەنها دەتوانێت لەسەر یەك شت کار بکات لە کاتێکی دیاری کراودا، گەر تۆ ووردبیتەوە لەسەر ئەو شتەی کە دەیڵێت زۆر قسە دەکەیت، بەڵام گەر ووردبیتەوە کە لە ملکەچی یەکی تەواوەتی دابیت بەرامبەر بە خواوەند، ئەو کاتە تۆ لە بەرزترین ئاستی خود دا دادەبیت.

گەنجەکە پرسی : بەرزترین ئاستی خود چی ئەگەیەنێت؟

وەڵامی دایەوە: تۆ خاوەن دوو خودیت، خودێکی بەرز و خودێکی نزم، یاخود بەمانایەکی تر دەروونی دڵنیا و دەرونی گلەیی کەر و دەروونی گوناە کەر و ئاڕاستە بەرزەکان .

گەنجەکە پرسی: ئاڕاستەی بەرز مانای چی؟



Scanned with CamScanner

وەڵامی دایەوە: واتە ڕوو لە خوا بکەیت. خواوەند لە سورەتی خەبەر ئایەتی ٢٧ و ٣٠" دا دەفەرموێت: ﴿ئەی دەروونی دڵنیا، ڕەزامەندانە بگەڕێرەوە بۆ لای خواوەندی خۆت و تێکەڵی بەندەکانم بەو وەرەناو بەهەشتەکەمەوە﴾

لێرەدا چاوی گەنجەکە بریسکەیەکی کرد ووتی: چەند حەز ئەکەم کە وابم.

کەسی دانا ووتی: ئەبێت بەیاری یەزدان.

گەنجەکە ووتی: بەم شێوەیە من ئەتوانم بڵێم کە فێری هونەری پەیوەندی گرتن بووم.

کەسی دانا ووتی: هونەری پەیوەندی گرتن بەشێکی کەمی ئاکارە، ئاکار دەتگەیەنێت بە خواوەند، با بگەڕێینەوە بۆسەر ئەو ڕێگایەی کە لێوەی دەستمان پی کرد و لێوەی گەیشتینە ئاکار ...

گەنجەکە وتی: بەر لە ئاکار چی بوو؟

وەڵامی دایەوە: نیەت.

گەنجەکە وتی: ئەی بەر لە نیەت؟

وەڵامی دایەوە: پشت بە خوا بەستن.

ووتی: ئەی پێش پشت بەستن بەخوا؟

وەڵامی دایەوە : نیەت پاکی.

ووتی پرسی: ئەی پێش نیە پاکی؟

وەڵام: گوێ ڕایەڵ بوون.



Scanned with CamScanner

پرسیار: ئەی پێش گوێ ڕایەڵی؟

وەڵام: باوەڕهێنان بە خواوەن.

کەسی دانا ووتی: ئەمە ڕێگای باڵابوونە، لە سەرەتاوە تا کۆتایی یاخود لە کۆتاییەوە بۆ سەرەتا، لە کۆتایی دا دەتوانیت بگەیت بە خواوەند، کەواتە با بچینە وێستگەی داهاتووەوە و بڵێین سوپاس بۆ خوا.... سوپاس بۆ خوا.



Scanned with CamScanner

# بلێ کار بکەن

خواوەند لە ئێمە داوا ئەکات کە پەی بە توانا بێ کۆتاکانی ناخمان ببەین....

خوازیارە پەی بەرین بەو مێشکە لێوان لێو لە پەرجووەی کە پێی بەخشیوین ... خواوەند بۆ ئەوە ئەو مێشکەی داوە بە مرۆڤ تا مەزنتر بێت و بیخاتە سەروو دروستکراوەکنی تریبیەوە.

کەسی دانا پرسی : دوای ئەوەی کەباسمان لە بنەما سەرەکی یەکانی ڕێگەی باڵابوون کرد، ئێستا پێت وایە کە ئەو ڕێگەیە کۆتایی پی هاتووە؟

گەنجەکە وەڵامی دایەوە: من ڕەنگە بەوە ڕازی بم کە فێری بووم و تەواوی توانم کۆبکەمەوە لەسەر ڕەزامەندکردنی خواوەند.

کەسی دانا ووتی: بەڵێ دەتوانیت، بەڵام کوا کار؟ کوا تێ کۆشان؟ کوا هەوڵ دان؟ پێویستە پەیوەندی کردن بە خواوە ئاوێتەی کار بێت، خواوەند لە سورەتی تەوبە ئایەتی ١٠٥ دا دەفەرموێت:﴿بلێ کار بکەن

لەبەر ئەوەی خواوەند و پەیامبەر و بڕوادارەکان کارەکانتان دەبینن و له دوارۆژدا پێتان دەوترێت کە چیان کردووە﴾.

خواوەند خوازیارە کە پەی بە توانا ناکۆتاکانی ناوەوەمان بەرین، خوازیارە پەی بەو مێشکە بەرین کە پێمان بەخشراوە، ئەو مێشکەی کە لێوان لێوە لەو پەرجوانەی کە مرۆڤ پەی پێ نابات. ئەو مێشکە خواوەند بەخشیوەیەتی بە مرۆڤ بۆ ئەوەی لەسەرووو بوونەوەرەکانەوە بێت، بۆیە دەبینین کە مرۆڤ باشترە لەو چیایانەی کەبەو پەڕی گەشەکرندی خۆیان گەیشتوون بەلاّم لەگەلّ ئەوەشدا نا جولّێن، بەلاّم مرۆڤ تا دواساتی ژیانی بەردەوام دەبێت لەسەر هەستانەوە و توانای جولاّنی هەیە، ڕووەکەکان گەشە دەکەن بەلاّم ناجولّێن، ئاژەلّیش گەورە دەبێت و ئەجولّێت بەلاّم بیر ناکاتەوە، گەر بیریش بکاتەوە ئەوا بەغەریزە بیر ئەکاتەوە، بەلاّم مرۆڤ لەلای خواوەند باشترینی ئەو دروست کراوانەیە خواوەند هۆشی پێ بەخشیوین بۆئەوەی باشترمان بکات لە چاو دروست کراوەکانی دیکەی دا. لێرەدا گەنجەکە ووتی: من ئەمە ئەزانم ئەی کەسی دانا، بەلاّم ئەو هۆکارە سەرەکی یانە چی یە کەلەبەر ئەوە خواوەند هۆش و بیر کردنەوەی پێ بەخشیوین؟

کەسی دانا بە پێکەنینەوە وەلاّمی دایەوە: تائەو جێگەیەی کە من ئەزانم، چوار بنەمای زۆر گرنگ و سەرەکی هەن کبریتین لە :

١. لێکدانەوەی زانستی: لەم ڕێیەوە مرۆڤ دەتوانێت پەی بە بوونی خواوەند ببات، خواوەند لە سورەتی عومران ئایەتی ١٩٠ و ١٩١



Scanned with CamScanner

دەفەرمێت: ﴿لە دروستکردنی ئاسمان و زەوی و جیاوازی شە و ڕۆژ پەند هەیە کە تەنها ئەوکەسانە لێی تێ دەگەن کە خواوەندیان لە یادە لەهەموو هەڵسان و دانیشتێکا و بیر لە دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی ئەگەنەوە و ئەڵێن خواوەند لە خۆڕا ئەم شتانەی دروست نەکردووە خوایە لە ئازاری ئاگار بمانپارێزە﴾. لەم ئایەتە پیرۆزەدا خواوەند هانمان دەدات کە تواناکانی مێشکمان بەکار بهێنین و مرۆڤ و دروست کراوەکانی بناسین، سەیری ئاسمان بکەین و ئەوە ببینین کە توانی بینینیمان هەیە و لەوەش بگەین کە دەی بینین. خۆر ببینین و لە جوانی یەکەی بگیەن و هەست بە هێزەکەی بکەین، بزانین مەبەست لەبوونی چییە؟ بەم شێوەیە باوەڕ و خۆشویستنمان بۆ خواوەند زیادتر دەبێت، ئەستێرە و باڵدارو باران دەبینین و هەست بە شنە با دەکەین، ئەوەی لەسەر زەوی هەیە دەیبینین، لەبوونەوەر و لە موعجیزەکان، ئایەتەکان ئەبینین و لێیان دەگەین، لەڕێی هۆشەوە پەی بە بوونی خواوەند دەبەین و لەوە دەگەین کە ئەم بوونەوەرانە دروستکەرێکیان هەیە. خۆمان دەبینینەوە کە پرسیار لە خواوەند و دروست کراوەکانی دەکەینەوە، خواوەند لەڕێی پەیامبەر و نێردراوەکانی یەوە یاریمان دەدات تا وەڵامی پرسیارەکانمان بدۆزینەوە.

٢. زانین: بەم شێوەیە هۆکاری دووەمی هۆش زانینە، لە لێك دانەوەوە بۆ زانین، ئەم زانینەش لە ڕێی پەیامبەر و نێردراوەکانی خواوە بە دەست دەهێنین، خواوەند هەموو شتێکی لەم گەردوونەدا لە



Scanned with CamScanner

پێناو مرۆڤ دا دروست کردووە. خۆر و مانگ و ڕەشەبا و باران و دەریا و ڕووەکەکانی خستۆتە خزمەتی مرۆڤەوە، توانای مێشکی پێ بەخشیوە بۆ ئەوەی دروست بکاتِ و بمێنێتەوە و پێش بکەوێت، بەم شێوەیە مرۆڤ خواوەند دەناسێت و بۆی دەردەکەوێت چی لێ دەوێت، ئەوەی کە خواوەند لە مرۆڤی دەوێت بریتیە لە پەرستن، خواوەندن لە سورەتی زاریات ئایەتی ٥٦ دا دەفەرموێت: ﴿من تەنها بۆ پەرستن ئەهریمەن و فرشتەکانم دروست کردووە﴾. لە لێکدانەوەوە بۆ زانین، لە زانینیشەوە هۆکاری سێ هەم دێت کە بریتی یە لە شارەزایی.

٣. شارەزایی: لێرەدا مرۆڤ شارەزا دەبێت لەبەرکارهێنانی مێشك دا، پەرەدەستێنێ و گەشە و داهێنان دەکات و دەزانێت چۆن پارێزگاری لە خۆی بکات و چۆن بژێوی خۆی دابین بکات. تا دێت خۆشویستنی خوای لە دڵدا زیادتر دەبێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، هەندێك کەس هەن کە باوەڕیان بەوەیە کەهۆکارەکان یارمەتی دەری بەدەست هێنانی ئامانجەکانن، لەبەر ئەوە سەوداو شیفتەی هۆکارەکان دەبێن و وون لەناو هۆکارەکاندا .... کەواتە لە لێکدانەوەوە بۆ زانین، لە زانینیشەوە بۆ شارەزایی لە شارەزاییشەوە بۆ داهێنان.

٤. داهێنان: لێرەدا مرۆڤ دەتوانێت داهێنان بکات، دەرەنجامی ئەم کارەش دروست کردنی فڕۆکە و کەشتی و موشەکە، ئەمە پێش کەوتنی هەمە لایەنە لە گشت بوارەکاندا، لێرەدا دەبینین کە موسڵمانەکان زیادتر باوەڕدار و نزیکتر و دڵسۆزتردەبن لەگەڵ خواوەند دا، بەڵام



Scanned with CamScanner

ئەوانی دی زیادتر سەرسامی هۆکارەکان دەبن، لەبەر ئەوە ئەبینین کە سەرتاسەری ژیانیان دەبێتە ئاستەنگ و نەخۆشی دەروونی و ئۆرگانێکی، تا ئەم کاسانەش سەرسامی هۆکارەکان بن خواوەند زیادتر ژیانیان لێ سەخت دەکات. لێرەدا گەنجەکە پرسی: کەواتە من چۆن مێشکم بەکار بهێنم بەشێوەیەکی ڕۆحی بۆ ئەوەی زانست و هۆکاری بەهێزم پێ ببەخشێت تا پەیوەندی بکەم بە خواوەندەوە.

کەسی دانا پێ کەنی و ووتی: بۆئەوەی بگەیت بە دانایی پێویستە هەنگاو بنێینە وێستگەی داهاتووەوە، فێربین کە چۆن ئەو دیارییەی خواوەند لە ژیانی ڕۆژانە ماندا بەکار بهێنین، با دەست بەکاربین و مێشکی مرۆڤایەتی بەکار بهێنین بۆ ئاشنا بوون بە:

١. دیدی ڕوون: مرۆڤ بەر لەهەر شتێکی تر خوازیاری بەدەستهێنانی دیدێکی ڕوونە، زۆر بە ڕوونی خۆی دەبینێتەوە لەکاتی بەدەستهێنانی ئەو دیدەدا و دەژی لەسوودمەندی یەکانی دا، ئەوکەسەی کە دیدی ڕوون بێت حەزناکات هێرشی بکرێتە سەرو ببێتە جێگەی گاڵتە پێ کردنی ئەوانی دی، لەبەر ئەوەی زۆر بە ڕوونی ئەبینێت بەڵام ئەوانی دی تواناى ئەو بینینەیان نیە ناتوانن درك بەو شتە بکەن کەئەو درکی پێ دەکات، ئەم جیاوازی یە لەزۆربەی داهێنراوەکانی مرۆڤ دا بەدی دەکرێت. دواتر کەسی دانا بە گەنجەکەی ووت: برایانی جویس دیدێکی ڕۆشن یان هەبوو لەسەر ئەوەی کە مرۆڤ دەتوانێت بفرێت، جلی پەڕیان لەبەر دەکرد، دواتر لەبەرزای شاخەوە خۆیان

فڕێ دەدایە خوارەوە. زۆر بە قورسی دەکەوتنە خوارەوە و ئێسك و پروسکیان دەشکا. خەڵکی گاڵتەیان دەکرد پێیان، تەنانەت پێیان دەوتن برایانی گێل، بەڵام بریانی جویس گوێیان بەو قسانە نەدا و بەردەوام بوون لە سەر تاقی کردنەوەکانیان، ئەزمون دوای ئەزمون دوای ئەوەی پشتیان بە یاسای سەر هەوا کەوتن و چۆنیەتی بەتاڵ کردنەوەی هەوا بەست، دەرەنجام توانیان ئەو فڕۆکەیە دابهێنن کە ئێستا بەکار دەهێنرێت. بەمەش دەوترێت دیدی ڕۆشن. گەنجەکە پرسی: بەڵام ئەی کەسی دانا خەونەکان دەکەونە کوێی دوائەنجامەوە، من پێم وابوو کە خەون دوا ئەنجامە. کەسی دانا وەڵامی دایەوە: دوائەنجام بریتی یە لەو هەستەی کە بەدڵنیاییەوە پێمان دەڵێت کە ئەوەی مرۆڤ دەیەوێت بەیاری یەزدان بەدەستت دەهێنێت. ئەمەش کۆتایی ڕێگەکەیە، بەڵام ئامانجەکان بریتین لەو هەنگاوانەی کەدەمان گەینێت بەخەونەکانمان، بەشێوەیەکی گشتی ئامانجەکان بە بەدی هێنانیان دوای دێت، بەڵام گەر ئەو ئامانجە ببەسترێتەوە بە دوائەنجامەوە بەردەوامیەت وەردەگرێت.... دواتر درێژەی پێ داو ووتی: گەر بتەوێت لە ماوەی پێنج ساڵدا ببیت بە بەڕێوەبەی گشتی کۆمپانیایەکی گەورە، بەم ویستنە دەوترێت دوائەنجام، گەر ئەم خەونە ڕوون بێت و کەسەکە پێی وابێت کە دەتوانێت بە دەستی بهێنێت ئەوا ئارەزوو دروست دەبێت و نیەتیش بە تەواوەتی ڕوون دەبێت. لێرەدا کەسکە دەست دەکات بە دابەش کردنی دوائەنجام بەسەر چەند هەنگاوێك، دا ئەم

هەنگاوانە بریتین لە ئامانجەکان، هەرئامانجێکیش دەبێت لەگەڵ توانا و سەرچاوە لەبارەکانی کەسەکەدا بگونجێت، کاتێکیش کە کەسەکە ئەو ئامانجە بەدەست دەهێنێت بەردەوام دەبێت لەسەر ڕێگەکەی و تا دەگات بە ئامانجی دواتر.... بەم شێوەیە بەردەوام دەبێت تا دەگاتە دوائەنجام. ئامانجەکان جگە لە پلەیەك کە دەمانگەیەنێت بە دوائەنجام شتێکی دیکە نیە، هەر ئامانجێکیش خزمەت بە ئامانجی دواتری دەکات، هەر ئامانجێکیش خزمەت بە دوائەنجام دەکات و نزیکمان دەکاتەوە لە گەیشتن پێی. لێرەدا گەنجەکە دوای ئەوەی کە سەری سوڕمانی خۆی نیشان دا لەو جیاوازییەی لە نێوان دوائەنجام و ئامانج دا هەیە زۆر سوپاسی کەسی دانای کرد بۆ ئەو هەموو زانیارییە.

٢. مەبەست: گەنجەکە پرسی مەبەست شوێنی دەکەوێتە کوێی دوائەنجام و ئامانجەوە؟ بۆچی مەبەست هەیە لە کاتێکا کە دوائەنجام ڕوونە؟ کەسی دانا پێکەنی و ووتی: بەبێ مەبەست دوائەنجام لە دەست دەچێت . بۆئەوەی کە ئامانجەکەت بەردەوامیەت وەربگرێت و دوائەنجام بە تەواوەتی ڕوون بێت، پێویستە ببەسترێتەوە بە مەبەستێکەوە تا سەرکەوتنت لەم دنیا و ئەو دنیادا بەردەوام بێت. لێرەدا بە ئامانج دەوترێت ئامانجی بەردەوام لەکات دا، مەبەست دەبێت ڕۆحانی بێت و لەبنەمادا پەیوەندی هەبێت بە خواوەندەوە، چونکە گەر وانەبێت هەروەك پێشتر باسم لێوە کرد. بە بەدەست هێنانی دوایی دێت. کەواتە گەر ئامانج تەنها ئامانج بوو ، ئەوا دوای بەدەست هێنانی



Scanned with CamScanner

دوایی دێت. بۆ نمونە گەر تۆ ماشێنت بوێت، دوای ئەوەی ماشێنەکەت دەکڕیت و ماوەیەکی کەم خۆش دەیگوزەرێنیت ئیتر ماشێنەکەت بە تازەیی نابینیتەوە، لەبەر ئەوەی کۆتایی پێ دێت. کەواتە مەبەست ئەو بەها بەرزەیە کە دوائەنجام بەهێز و ڕوون و ئاسان دەکات و هەڵسەنگاندن و گەیشتن بە مەبەستیش مەیسەر دەکات. بەبێ مەبەست مرۆڤ ڕێ وون دەکات و لە هۆکارەکاندا دیار نامێنێت، لە ئەگەرەکاندا گومڕا دەبێت. لەبەر ئەوە خەونەکان بە خواوەندەوە گرێ بدە بەم ڕێگەیە تۆ دەتوانیت هاوسەنگی بکەیت لە نێوان ئەم دنیاو ئە دنیادا.

گەنجەکە وتی: ئایا مەبەست ئەو بەها بەرزەیە کە دەبێت پێی بگەین؟

کەسی دان وەڵامی دایەوە: بەڵێ، لەبەر ئەوەی بە نەبوونی لە هۆکارەکاندا وون دەبێت هەروەك پێشتر باسم لێوە کرد.

گەنجەکە وتی: واتە کەسە سەرکەوتووەکان لە ژیاندا مەبەستیان هەیە؟

کەسی دانا وەڵامی دایەوە: بەڵی، بەلام گەر مەبەست پەیوەندی بە مادەوە هەبوو، خواوەند لەم دنیادا پێی دەبەخشێت و ئەویش چێژی لێ دەبینێت.



Scanned with CamScanner

بۆنمونە کاتێك کە کەسێکی بێ باوەڕ زۆر دەوڵەمەند دەبێت، کەسی باوەڕ دار دوای بینینی دەڵێت: چۆن کەسێکی ئاوا بێ باوەڕ دەتوانێت دەوڵەمەند بێت؟ بۆچی خواوەند ئەو هەموو پارەیەی پێ بەخشیوە؟

هۆکاری یەکەم: ئەو پارەیە دەبێتە بەڵا بۆ ئەو کەسە چ لەم دنیا و چ لەو دنیا.

هۆکاری دووەم: خواوەند خۆی بەخشندەیە، خۆی بەهەمووان دەبەخشێت، ئەو کەسە بێ باوەڕەش کەلەم دنیایەدا کاردەکات و ماندوو دەبێت خواوەند حەقی خۆی پێی دەبەخشێت و ئەوەی کە پێویستی بێت لە سامان و ماڵ و هاوڕێ و پەیوەندی، خواوەند پێی دەبەخشێت، کاتێك کەبە خواوەند دەگات، هەژار دەبێت و خاوەنی هیچ شتێك نابێت.

٣. چی یەتی ئەم کارە: گەنجەکە دوای سوپاس کردن پرسیاری کرد: بەڵام بۆ؟

کەسی دانا بە پرسیارێك وەڵامی دایەوە: تۆ ئەتەوێت سەرکەوتوو بیت؟

وەڵامی دایەوە: بەڵێ.

کەسی دانا پرسی : بۆ ئەتەوێت سەرکەوتوو بیت؟

گەنجەکە پرسی: لەبەر ئەوەی بەبێ سەرکەوتن ناتوانم لە ژیانمدا پێشبکەوم. بەبێ سەرکەوتنیش هیچ پێوەرێك نامێنێت بۆ پێش کەوتنم لە ژیاندا.



Scanned with CamScanner

کەسی دانا: تێکڕای قسەکانت گشتاندن بوو، هیچ شتێکی دیاری کراوی تێدا نەبوو، جارێکی تر دەپرسمەوە، بۆ ئەتەوێت سەرکەوتووبیت؟ گەنجەکە پێکەنی و بەکەسی دانای ووت: ئێستا تێ گەیشتم، سەرکەوتن لە چ بوارێك دا و بەدیاری کراوی.

کەسی دانا بە پێکەنینەوە وەلآمی دایەوە: ئێستا تێگەیشتی، هەمیشە لە پرسیار کردندا ئەوەی کەدیاری کراوە دا لەبەر چاوی بگرە، بۆئەوەی بزانیت چۆن وەلآم دەدەیتەوە.

سەرکەوتن لە ژیاندا دەبێت حەوت بنەما لەخۆ بگرێت سەرەتا لە بنەمای ڕۆحی و لەوێ وە بۆ تەندروستی و کەسایەتی و خێزانداری و پیشەیی و مادی. لێرەدا بە کەمێك درێژە پێ دانەوە باس لە بنەمای ڕۆحانی دەکەین:

بۆچی نوێژ دەکەیت؟

گەنجەکە وەلآمی دایەوە؟ بۆئەوەی لە خواوەند نزیك ببمەوە و گوێ ڕایەڵی بم بە دڵسۆزی و بە نیەت پاکی هەروەك فێرت کردم .

کەسی دانا وەلآمی دایەوە: کەواتە ئەمەیە مەبەستی سەرەکی نوێژ کردن؟ دواتر پرسی، بۆ ئەتەوێت تەندروستیت باشتربێت .

گەنجەکە وەلآمی دایەوە: لەبەر ئەوەی بەبێ تەندروستی ناتوانم هیچ شتێك بکەم.

وەئەگەر نەخۆش بکەوم ناتوانم پێش بکەوم.

کەسی دانا پرسی: تەنها ئەمە؟

گەنجەکە پێ کەنی و ووتی: بێ گومان نەخێر، لەبەر ئەوەی خواوەند تەندروستیمان وەك دیاری پێ دەبەخشێت و دەروازەیەکە لە دەروازەکانی گەیّ ڕایەڵی کردن، بە خواوەند ئەڵێم: ئەی خوایە ئەم دیارییەت پێ بەخشیوم، منیش بە یارمەتیتان پارێزگاریم لێ کرد.

کەسی دانا ووتی: ئەمەیە مەبەست، بەبێ مەبەست خەون بوونی نامێنێت، بەبێ خەون هیچ پێویست بەئامانج ناکات بەبێ ئامانجیش مەبەست بوونی نامێنێت کەواتە پێویستە خەون و ئامانج و مەبەستمان هەبێت.

گەنجەکە پرسی : باشە هۆکار هەر مەبەستە؟

کەسی دانا: بەڵێ، هۆکارەکان هەست دەوروژێنن، هەستی وروژاویش ئارەزوویەکی گڕگرتوو دروست دەکات، دەبینیت خواوەند بە پێغەمبەر دەڵێت:( لەڕێی خواوەندا ئارەزوو بکە). لەبەر ئەوی کە ئارەزوو هەستێکی گڕگرتووە، خواوەندیش ئارەزووەمەندە کە ڕووی تێ بکەین و بە گوێی بکەین، بەویستی خۆمان دەمانەوێت، بە ئارەزوویەکی گڕگرتوو خۆشویستنێکی دڵسۆزانە، بە ئاشتی و بە گوێڕایەڵی، بە پاکی و بە نیەت پاکی بەپشت بەستنێکی تەواوەتی و بەگەشبینی یەك لە خواوەندەوە.

## ئامانجەکان

گەنجەکە ووتی: من چۆن دەتوانم سوپاست کەم ئەی کەسی دانا، ئەوەی لە تۆوە فێر بووم لەم چەند ڕۆژە کەمەدا لەتەواوی ژیانمدا فێری نەبووم، ئێستا مەبەست لە کۆی ئەم شتانە چی یە؟



Scanned with CamScanner

کەسی دانا: دیارە لە یادت کردووە، ئامانج بریتی یە لەدابەش کردنی دوائەنجام، زۆربەی خەڵکی دەڵێن کە ئامانجێکمان هەیە، بەڵام لە ڕاستیدا خاوەنی دوا ئەنجامن، دوائەنجام دادەنرێت بە دوا وێستگەی خواستەکان. بەڵام ئامانجەکان بریتین لە دابەشکردنی دوائەنجام، هەرئامانجێك ئامانجی دواتری لەسەر دروست دەکرێت، هەموو ئامانجێکیش خزمەتی بە دوائەنجام دەکات. هەوەك دەزانین ئێستا دوائەنجام دوا وێستگەی ئەو خوازراوەیە کە مرۆڤ دەیەوێت پێی بگات، مەبەست دەبێت پەیوەندی بەخواوەندەوە هەبێت بۆئەوەی دوائەنجام بەردەوامیەت وەربگرێت، بەمەش دەوترێت سەرکەوتنی بەردەوام لەکات دا. بەڵام کاتێك کە قسە لەسەر ئامانج دەکەین ئەوکاتە دوائەنجام دابەش دەکەین ..... ئامانج بریتی یە لە هەنگاوەکان.... بریتی یە لەو قالدرمانەی کە مرۆڤ پیادا سەردەکەوێ پلە لە دوای پلە تا دەگاتە ترۆپك، ئەمە پێی دەوترێت دوائەنجام کەواتە پێویستە جارێکی تر ئەوە بزانیت کە گەر دوائەنجام نەبێت، ئامانجیش نابێت گەر ئامانجیش نەبێت، مەبەستیش نابێت گەر ئامانج نەبێت، ماناش بوونی نابێت گەر ماناش نەبێت، خەونەکان لە دەست دەچن، گەر خەونەکانیش لە دەست بچن مرۆڤیش لە دەست دەچێت. هەر لە ئێستاوە دەبێت ئەوە بزانیت کە پێویستە خەونەکانت ڕون بن، تا زیادتر ڕوون بن زیادتر جۆش و خرۆشت دەبێت بۆ ئەنجامدانی، هەر کاتێکیش کە ئەو جۆش و خرۆشە بوونی هەبوو، ویستت بەهێز تر



Scanned with CamScanner

دەبێت، لێرەوەیە کە بە تەواوەتی پێویست بوونی ئەنجامدانی خەونەکان دێنە ئاراوە، لەبەر ئەوەی لە خواوەند نزیکترت دەکاتەوە، بۆ ئەو ساتەی کە تیایدا دەژیت سوپاسی خواوەند بکە.... بەوپەڕی پێ زانینەوە بەردەوام بە لەسەر ئەوکارە و هیچ کات دەستبەرداری مەبە .

گەنجەکە ووتی: نەخێر.

کەسی دانا پرسی: بۆ دەستبەرداری نابیت؟

گەنجەکە ووتی: لەبەر ئەوەی خوا دروستی کردوم کەبخۆم و بخۆمەوە، گەر خواردن و خواردنەوەش نەبوایە دەرمردم و کۆتاییم نزیک دەبوو .

کەسی دانا ووتی: کەواتە ئەم شتە بۆ تۆ گرنگە، لەبەر ئەوەی گرنگ بوون و گرنگی پێ دان لە گرنگترین ئەوشتانەن کە دەبێت فێریان بیت و بیانناسیت بۆ ئەوەی بگەیت بە خەونەکەت .

گەنجەکە ووتی: گەرمن خەونێکم هەبوو، ئەو خەونەشم بەستەوە بە خواستی خواوەندەوە و ئامانجیش لەو خەونەدا دیاربوو، دوائەنجامیشم بەش کرد بەسەر چەند بەشێك دا و دەستم کرد بەکار کردن، ئایا ئەمە بەسە؟

کەسی دانا پێ کەنی و ووتی: ئەی کوڕی گەنج تۆ هەمیشە پەلەی بە دەست هێنانی ئامانجەکەتە، بەڵام لە ڕاستی دا بۆ ئەوی ئامانجەکەت بە دەست بهێنیت پێویستە لە هەموو هەوڵ دانێك دا شتێك بە دەست



Scanned with CamScanner

بهێنیت و له دەستی نەدەیت، لەبەر ئەوە پێویستت بە زانیە، دواتر ئەم زانینە دەبێت کاری لەسەر بکرێت تا دەبێت بە شارەزایی.

گەنجەکە پرسی: جیاوازی چی یە لە نێوان زانین و شارەزایی دا؟

کەسی دانا وەڵامی دایەوە: جیاوازی یەکی زۆر هەیە، هەر ئەوەندە کە تۆ کتێبێك دەگریت بە دەستەوە و دەست دەکەیت بە خوێندنەوەی، زانیاری لەسەر کتێبەکە بە دەست دەهێنیت، بەر لەوە تۆ ئەو زانیارییەت نەبوو، من ئەگەر ئێستا هەندێك شتت پێ بڵێم ڕەنگە کەمێك زانیارییت پێ ببەخشێت، زانیاری شتێکە کە یاخۆت فێری دەبیت یاخود لە ڕێگەی زاناکان، کەسەداناکان، کتێب گەلە جۆراو جۆرەکان، بیستن و ببینینەوە بەدەستی دەهێنیت. بەشێکی زۆری خەڵکیش زانیارییان هەیە، لەبەر ئەوە خاوەن هۆش هۆش توانای ئاڵوگۆڕ پێ کردنی هەیە، هۆش توانای پەی پێبردنی هەیە، تۆ هەر ئەوەندە کە پرسیار لە کەسێك دەکەیت چی ئەکەیت؟ پێت دەڵێت: من دار تاشم، یاخود دەڵێت من ئاسنگەرم، یان ئەندازیارم، پزیشکم، تۆ بەم وەڵامانە کاری کەسکە دەزانیت بەڵام نازانیت کە چۆن ئەنجام دەدرێت. زانین ئەوەیە کە تۆ زانیارییەکان بزانیت، بەڵام شارەزایی ئەوەیە کە بزانیت چۆن ئەوکارە ئەکەیت، بۆنمونە کەسێك ئەبینیت کە زۆر سادەیە و کەمێك زانیاری لەلایە و لەمەڕ زانینەوە قسەت لەگەڵ دەکات، یاخود تۆ هەندێك زانیاری لێ وەردەگریت، دواتر هەر یەك لە ئێوە دەچێت بەرێی خۆی دا، بەڵام دەبینیت کەسکە زۆر دڵخۆشە،



Scanned with CamScanner

نەتەنها هەر ئەوەندە بەڵکو خەونەکانی بەدەست دەهێنێت و بەلام تۆ نەخێر.

گەنجەکە ووتی: بۆ؟

کەسی دنا وەلامی دایەوە: لەبەر ئەوەی تۆ زانیاریت هەیە بەلام ئەوکەسە جگەلە زانیارییەکەی شارەزاشە، شارەزایی بریتی یە لەوەی کە چۆن بتوانیت کارێك بکەیت، کاتێك کە تۆ لەمەڕ مەلە کردن دەخوێنیتەوە زانیاریت لەسەر مەلەکردن دەبێت، بەلام ناتوانیت مەلە بکەیت، تەنها کاتێك نەبێت کە بەتەواوەتی لەمەلە کردن دا شارەزاییت. ئەم شارەزاییەش بە دەست دێت، کاتێك کە تۆ ئەم شارەزاییە دووبارە دەکەیتەوە و بەیاری یەزدان دەچیتە ڕیزی کەسە سەرکەوتووەکانەوە. پێویستە تۆ زانیاری و شارەزایی تەواوەتیت هەبێت، بۆ ئەوەی بە دەستیشی بهێنیت، پێویستە چوار بەشی سەرەکی بە دەست بهێنیت.

**یەکەم: خوێندنەوە:**

خوا دەفەرموێت( بخوێنە) ئەمە یەکەمین ئایەت بوو کە بۆ پێغەمبەر (د.خ) هاتەخوارەوە لەلایەن سەروەرمان (جبرەئیل). باشەچی دەخوێنیتەوە؟ قورئانی پیرۆز دەخوێنیتەوە، لەبەر ئەوەی گەر ئەو نزیکایەتیە بکەیت لەم دنیاو لەو دنیاش لەگەڵت دەبێت، لەبەر ئەوە پێویستە کە بخوێنیتەوە و لێی بگەیت و شارەزا بیت تیایدا و دوا جار فێری کەسی تریشی بکەیت، بەم شێوەیە فێرکردن و زانین

بەردەوام دەبن لەکات دا تا دواڕۆژ. کەواتە زانین بە خوێندنەوە دەست پێ`دەکات. تۆ لانی کەم لە ڕۆژێك دا دەبێت (٢٠) خولەك بخوێنیتەوە، لەبەر ئەوەی خوێندنەوە زۆر گرنگە و هێزت پێ دەبەخشێت لێرەوەیە کە خواوەند دەفەرموێت:﴿بڵێ ئایا یەکسان دەبن ئەوانەی کە کار دەکەن لەگەڵ ئەوانەی کە کار ناکەن﴾. تەنها بە خوێندنەوە، دەزانیت و دەبیت بە زانا لەو بوارەدا. هەر شتێك کە بیکەیت زانا دەبیت تیایدا، لەبەر ئەوەی هەوڵبدە لانی کەمی کات لەڕۆژێکدا تەرخان بکەیت بۆ خوێندنەوە، بەم شێوەیە تۆ توانای زەینت بەهێز دەکەیت، هێزی بیرکردنەوەت هێزی دەرك پێ کردنت، هێزی وورد بوونەوەت، هێزی سەرنجت و هێزی هەستەوەرەکانات، بەم شێوەی پێ زانینێکی زۆر جوانت لەلا گەڵاڵە دەبێت. کاتێك کە زانیارییەك زیاد لە جارێك دەخوێنیتەوە دەبێت بەبەشێك لەتۆ و تۆش دەبیت بە بەشێك لەئەو، دواتر کارامە دەبیت، کارامە دەبیت لە ووتنی دا کارامە دەبیت لەقسە کردن لەسەری، تۆ دەبیتە کەسێکی کارامە و بەم شێوەیە دەبێت دەست بەکار بیت. من دواتر لەسەر کاری ستراتیژی لەگەڵت دەدوێم لێرەدا

گەنجەکە ووتی: کاری ستراتیژی؟

کەسی دانا: بەڵێ کاری ستراتیژی؟

گەنجەکە ووتی:جیاوازی چی یە لە نێوان کار جی`بەجێ کردن و کاری ستراتیژی .

کەسی دانا پێ کەنی و ووتی: دواتر، بەڵام ئێستا ڕێگە بدە لەسەر زانین قسە بکەین، بۆ ئەوەش کە تۆ ڕۆژانە زانیارییت هەبێت دەست بکە بە خوێندنەوە بەشێوەیەك تەنانەت گەر بۆ (٢٠) خولەکیش بێت، دواتر هەست دەکەیت کە کاتت هەیە، دڵنیاش بە کە کاتت دەبێت، تۆ نیوەی تەمەنت لە خەودا بەسەر دەبەیت، بەشێکی دیکەی تەمەنت لە خواردن و قسە کردن لەسەر ئەوانی دی بەسەر دەبەیت، بەشێکی دیکەی تەمەنت لە چاوەڕوانی دا بەسەر دەبەیت، لەبەر ئەوە تۆ کاتت هەیە، بە دڵنیاییەوە تۆ دەتوانیت (٢٠) خولەك کارێك بکەیت بارودۆخ هەر چۆنێك بێت و باری دەروونیت هەر چۆنێك بێت و هۆکارەکانیش هەرچیەك بن، کاریگەر یەکانیش هەرچی یەك بن و دۆخیش هەر چۆنێك بێت، دواتر لە چاوی گەنجەکە وورد بۆوە و ووتی: هەل و مەرج هەرچۆنێك بێت تۆ لە من تێ دەگەیت وانیە؟

## دووەم: گوێ گرتن

گەنجەکە ووتی: تەنها خوێندنەوە بەسە؟

کەسی دانا وەڵامی دایەوە: ڕەنگە بەس بێت بەڵام کارامەیی تەواوەتی خوازیاری ئەوەیە کە تۆ هەر پێنج هەستیارەکەت بخەیتە کار لەبەر ئەوە کاتێك کە گوێ لە هەندێك نەوار (شریت) دەگریت تۆ هەستیاری بیستنت بەهێز دەکەیت، زانایانی عەرەب و زانایانی ڕۆژئاوا دەتوانن زانیارییەکی زۆر پڕ بەهات پێ ببەخشن، کاتێکیش کە تۆ ئەم



Scanned with CamScanner

زانیارییه بۆ زیاد له جارێك دەبیستیت زۆر شارەزا دەبیت تیایدا، کاتێکیش که قسەی له بارەوە ئەکەیت، زۆربه ڕوونی و جوانی و کارامەیی قسەی له بارەوە ئەکەیت، سەرەتا لانی کەم بۆ ماوەی (٢٠) خولەك له ڕۆژێك دا بخوێنەرەوە و گوێ لەیەك نەوار یا خویەك سیدی بگرە. گەر خوازیاری بەدەست هێنانی زانیاری و کارامەییت ئەم کارە دەبێت ڕۆژانە ئەنجام بدەیت.

<u>سی٘هەم: بینین</u>

گەنجەکە ووتی: ئایا ئەمە بەسە؟

کەسی دانا وەڵامی دایەوە ووتی: ڕەنگە بەس بێت بەڵام من دەمەوێت تواناکانی بینینیش بەهێز بکەیت، لەبەر ئەوە پێویستە خۆت لەسەر شاشەکانی نمایش کردن ئەم شتانە ببینیت لەڕێی ڤیدیۆ یاخود (D.V.D)ەوە تۆ بەم کارە مانای جوڵەی ماسولکەکانی دەموچاو هەست پێ دەکەیت، هەروەها جوڵەی جەستە و هەناسە دان و شێوازی ووتن هەروەها تۆنی دەنگ و بەرزی و نزمی یەکەی، لەبەر ئەوەی مرۆڤ بەوێنە بیر دەکاتەوە لەبەر ئەوەشە کە خواوەند لە سورەتی نەحل ئایەتی ٧٨ پێمان دەڵێت: ﴿گوێ و چاوم بۆ دروست کردوون کە ڕەنگە سوپاس بکەنل﴾. بەم شێوەیە تۆ هەستیارەکانت بەهێز ئەکەیت کاتێك، کە کتێبەکە دەگریت بە دەستەوە و ئەی ناسیت، کاتێکیش کە گوێ لە نەوارێك دەگریت لایەنی بیستنت بەهێز دەکەیت، لایەنی



Scanned with CamScanner

بینینیش بەهێز دەکەیت کاتێك کە لە ڤیدیۆ یاخود(D.V.D) یەکە دەنواڕی.

**چوارەم: ئامادەکاری**

شتێکی دیکەش هەیە کە بریتی یە لە وەی کە تۆ لانی کەم دەبێت هەمیشە ئامادەبیت. من بۆیە دەڵێم لانی کەم لەبەر ئەوەی کاتێك کە خۆت ئامادە دەکەیت لەگەڵ کۆمەڵێك لە خەڵکی دا دەبێت کە خوازیاری پەرە پێدانی تواناکان و بەرە و پێش چوون و گەشە کردنن بەشێوەیەکی پۆزەتیڤانە لە ژیاندا. ڕەنگە هەندێك کەسی پۆزەتیڤیش بناسیت و ببیتە خاوەنی ووزەیەکی پۆزەتیڤ کە یارمەتیت دەدات پێش بکەویت و بگەیت بە ئامانجەکانت وبگەیتە خەونەکانت.

گەنجەکە ووتی: ئایا پێویستە من هەموو مانگێك ئەم کارە بکەم؟

کەسی دانا: تۆ گشت مانگێك نان ناخۆیت؟ هەموو مانگێك ناخۆیتەوە؟ خوازیاری ئەوەنیت کە هەموو مانگێك باش و باشتربیت؟ کەواتە بەم شێوەیە دەبێت خۆراك خواردنی جەستەیە، خوێندنەوەش خۆراکی زەین و هۆشە، بەم دووانەیە کە تۆ دەگەیتە خواوەندی خۆت، بەم شێوەیە تۆ خۆراك بەڕۆحیش دەدەیت، بەبێ خوێندنەوە هیچ کات نازانیت خۆراك بەیت بەهیچ کام لەوانەی کەباسیان لێوەکرا. خەڵکی بەشێوەیەکی گشتی بە دوای باشترین خۆراك دا دەگەڕێت کە بیدەن بە جەستەیان، منیش دەمەوێت کە زەینی ڕۆحی خۆت لە ڕێگەی خوێندنەوە و نزیك بوونەوەی زیادتر لە خواوەند پەرەپێ بدەیت. ئەی



Scanned with CamScanner

کوڕی گەنج من بەمە دەڵێم کارامەیی تەواوەتی، ئەو کارامەییەیی کە کار بە سەرجەم هەستیارەکان دەکات. بەشێوەیەك کە هەر هەستیارەێك کارامەیی خۆیی دەبێت، ئەزانێت کەی گوێ بگرێت وچۆن گوێ بگرێت، هەروەها چۆن قسە بکات و دان بە وشەکاندا بنێت و چۆن گوزارشت لە بۆچوونەکانی بکات، هەروەك چۆن زاناکان قسە دەکەن ئەمیش قسە بکات. خەڵکی گوێت لێ دەگرن و حەز دەکەن لێت نزیکتربن، لەبەر ئەی کە زانیاریت لەلایە، بزانە ئەو کەسەی کە زانیاری لەلایە خەڵکی بە سەربەستی و بەمەبەستی فێر بوون لێی نزیك دەبنەوە، بۆیە خواوەند لە سورەتی زمر ئایەتی ٩ دەفەرموێت: ﴿بڵێ، ئایا یەکسان ئەوانەی کە ئەزانن لەگەڵ ئەوانە کە نازانن﴾ تۆ ئەزانیت و حەز دەکەیت کە خەڵکیش لە تۆوە فێر بن بەم شێوەیە بەردەوام دەبیت لەسەر پەیامەکەت و چاکەت بەردەوام دەکەیت.

گەنجەکە ووتی: دوای ئەو هەموو شتەی کەلە تۆوە فێر بووم ئایا بەسە بۆ ئەوەی کە بە ئامانجەکانم بگەم و بگەم بەخونەکانم؟ چونکە من هەموو هۆکارەکانم لەبەر چاو گرت، هەموو شتێکم بەم خستە شوێنی خۆی کارامەیی تەواوەتم وەرگرت، ئایا ئەمە بەسە؟

کەسی دانا وەڵامی دایەوە: ڕەنگە بەس بێت.

گەنجەکە وتی: تۆ هەمیشە پێم دەڵێیت ڕەنگە بەی بێت، بەڵام ئایا زیادتریش هەیە؟



Scanned with CamScanner

کەسی دانا وەڵامی دایەوە: بەڵێ لەبەر ئەوەی ڕێگەی باڵا بوون سنور و کۆتایی نیە بە بەردەوامی کارێك هەیە کە دەبێت تەواو بکرێت.

لەبەر ئەوە با پێکەوە بڕۆین لەسەر ڕێگەی باڵا بوون بۆئەوەی بگەینە وێستگەی دواتر کە بریتیەلە:

## کاری ئستراتیجی

کارە کەجیاوازی دەکات لە نێوان:

- سەرکەوتن و شکست دا.
- ئاسوودەیی و نا ئومێدی دا.
- نێوان پێش کەوتن گەیشتن بە ترۆپك یاخود قەتیس مان مانەوە لشوێ،ی خۆدا.

کردار جیاکاری ناکات لەنێوان ووتە و ڕاستی دا.... لەنێوان خەیاڵ و زیندە خەون دا،.... لەنێوان خەیاڵ و ئەو خەونەی کە دەبێتە ڕاستی. هەومرك پێشتر پێم ووتی لەسەر کردار، کاتێك کە لەسەر مەلەکردن دەخوێنیت و زیادتر لەسەر ئەو بابەتە دەخوێنیتەوە بە تەواوەتی لەو بوارەدا کارامە دەبیت، بەڵام ئەم کارامەییە ئەو هەلەت ناداتێ تاببیتە مەلەوانێکی زۆر کارامە و شارەزا، تۆ پێویستە مەلە بکەی، واتە ئەنجامدانی کردارەکە. گەر بێتو زانیاری و ئەزمون و شارەزاییەکەیشت نەخەیتە بواری کارکردنەوە، ناتوانیت بەکاری بهێنیت و سەرکەوتووش نابیت تیایدا لەبەر ئەوە پێویستە لەسەرت کرای ستراتیجی بکەیت .

گەنجەکە ووتی: کاری ستراتیجی؟ بۆچی دەست پێ بکەم؟

کەسی دانا ووتی: هەنگاوی یەکەم لە کاری ستراتیجی دا بریتی یە لە پلان دانان بۆ نمونە گەر ویستت زمانێك فێر بیت ئەبێت بزانیت کە بۆچی دەتەوێت ئەو زمانە فێر بیت؟ مەبەست لەوکارە بزانیت. ئەم مەبەستە بریتی یە لە ئامانج کە یارمەتیت دەدات. بۆنمونە دەتەوێت ببیت بە بەڕێوەبەرێکی گەورە لە کۆمپانیایەك دا، کاتێك کە دەگەیتە ئەو پۆستە ئەبێت یارمەتی ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی بدەیت، بەم شێوەیە زیادتر لە خواوەند نزیك دەبیتەوە، زمان هێزی زایادتریت پێ دەبخشێت، زمان بۆخۆی یەکسانە بەیەك مرۆڤ، لەبەر ئەوە تۆ زمانێك فێر دەبیت قسەی پێ دەکەیت لەگەڵ خەڵکی دا بەم شێوەیە تۆ ئاسۆکانی ڕوانینت بەر فراوانتر دەبێت، ئەخوێنیتەوە و کارامە دەبیت، بەم شێوەیە تۆ لە هەرە باشەکان دەبیت. باوای دابنێین تۆ دەتەوێت زمانێك فێر بیت بۆ ئەم کارە پلان دابنێ، پلان دانانیش بریتی یە لەوەی کە خوێندنگە و پەیمانگەی تایبەت بەم کارە هەبێت کەتیایدا فێری زمان بیت، دەڵێیت:

یەکەم: ڕەنگە لە تەلەفزیۆنەوە فێر بیت.

دووەم: ڕەنگە لە فەرهەنگی زمانەوە فێر بیت.

سێ هەم: ڕەنگە لە کتێبەوە فێر بیت.

چوارەم: ڕەنگە لە ڕێی یەکێك لە هاوڕێ بێگانەکانتەوە فێر بیت.



Scanned with CamScanner

بۆنموونە ڕەنگە تۆ بچیت بۆ پەیمانگەیەك یاخود سەنتەرێك بۆ فێر بوونی زمان، بەم شێوەیە تۆ پلانت داناوە، دواتر هەنگاوی یەکەم دەنێیت بەوەی کە دەچیت بە چاوی خۆت دەبینیت کەچی دەکەن و ڕۆژانە بەژداری دەکەیت، چوار ووشە دەخوێنیتەوە و بە تەواوەتی لەبەری ئەکەیت دواتر بەسەر کۆمەڵێك شت دا دابەش دەکەیت بۆ نموونە دەڵێیت: گەر لە چێشت خانەیەك دا بووم و وویستم تەنها بەم زمانە قسە بکەم یاخود لە وڵاتێك دا بووم و ئەو وڵاتەش تەنها بەو زمانە قسەی دەکرد فێر دەبیت چۆن داوای خواردن بکەیت. چۆن داوای بڕی تێ چوون دەکەیت، تۆ بە دیاری کراوی چیت پێویست بێت لە چێشتخانەکەدا فێری دەبیت، هەروەها لە فڕۆکەخانەیەکدا، ئەوەی پێویست پێی بێت فێری دەبیت و بەم شێوەیە تۆ بەشێوەیەکی خێراو کاریگەر زمان فێر دەبیت، بەمەش دەوترێت کرداری ئیستراتیجی. باوای دابنێین کە تۆ دەتەوێت سەفەربکەیت بۆ وولاتێکی بێگانە، یاخود هەر وڵاتـێکی دیکە تۆ سەرەتا پلان دادەنێیت و پرسیار لە کۆمپانیا گەشتیاری یەکان دەکەیت: بلیتەکان چۆنن و جۆرییان چی یەو نرخیان چەندە؟ دواتر بە چ ڕێگەیەك سەفەر بکەیت، بەفڕۆکە یاخود بە قەمەرە یاخود پاس. تۆ بەر لە هەموو شتێك پلان دادەنێیت و هەرئەوەندەی تۆ پلانت داناو دیاریت کرد کەچیت دەوێت و چۆن دەگەیت ئەوە تۆ پلانی ستراتیجیت داناوە.



Scanned with CamScanner

بۆنمونە: بابگەڕێینەوە سەر زمان، تۆ بەڕاستی دەستت کرد بە فێر بوونی بەشێوەیکی پراکتیکی، هەرئەوندە کە چوویتە بواری کارکردنەوە، ئەوا ئیدی تۆ هەڵدەستیت بەهەڵسەنگاندن، تۆ دەبێت ئامانجەکەت هەڵبەسەنگێنیت، هەروەها هەنگاوەکانت هەڵبەسەنگێنیت واتە: ئایا تۆ لەسەر ڕێگەی دروستیت؟ ئایا ئەمە ئەو ئاستەیە کە تۆ داوای دەکەیت؟ ئایا ئەمە ئەو زانیارییانەیە کەتۆ هەڵدەستیت بەکاری هەڵسەنگاندن، کاتێك کە تۆ هەڵدەسەنگێنیت ڕەنگە کاری چاکسازیش بکەیت، لەبەر ئەوەی ڕەنگە ئەو ڕەوشەی کە تۆ هەتە لە فێر بوون دا نەتوانیت لە مامۆستاکەتەوە فێری ببیت، ڕەنگە لە چەند سەرچاوەیەکەوە بتوانیت فێر ببیت لەوانە مامۆستا و کتێب گەلی جوارو جۆر.

لەبەر ئەوە دەڵێین: باشترین ڕێگە بۆ فێر بوون ڕێگە وێنەییە، تۆ ئەبینیت کە هەڵسەنگاندن دەمانگەیەنێتە چاك کردن. چاککردن گۆڕان لە پلانەکەت دا دروست دەکات. کاتێك کە گۆڕان لە پلانەکەت دا دروست دەکەیت بۆ ساتێك دەوەستیت و فێر دەبیت کە چیم هەڵسەنگاندووە و چاك کردووە، لێوەی فێر بوویت بەر لەوەی جارێکیتر بیخەیتە بواری کارکردنەوە و بەردەوام دەبیت لەسەر پلان دانانی ستراتیجی، ئەم کارە بەشێکی گەورەیە لە کرداری ستراتیجی، پلان دادەنێیت و دەیخەیتە بواری کر کردنەوە، هەڵدەسەنگێنیت و چاك سازی دەکەیت و فێر دەبیت، کرداری ستراتیجی هەنگاو بە هەنگاو

پێت دەڵێت کە تۆ لەسەر ڕێگەی دروستیت یاخود ڕێگەکەت هەڵەیە. هەندێك کەس بەتەواوەتی هێزیانەوە دەست بەکار دەبن و بەردەوام دەبن لەسەر کارەکەیان، کاتێکیش کە دەگەنە کۆتایی ڕێگەکە، بۆیان دەردەکەوێت کە هیچیان بە دەست نەهێناوە، لەبەر ئەوەی دەرکیان بەوە نەکرد بوو کە ئەو ڕێگەیەی کە ئەوان گرتبوویانە بەر ڕێگەی دروست نەبووە بۆ گەیشتن بە ترۆپك، لەبەر ئەوە دووبارە دەست دەکەنەوە بە گلەیی کردن و دەست بەرداری خەونەکەیان دەبن، چونکە هەست دەکەن زۆر دوورن لە خەونەکانیانەوە، ئەوەش کە دەیکەن شکستیان پێ دەدات، بەڵام لە ڕاستی دا شکست پێویستە بۆ سەرکەوتن.

گەنجەکە پرسی: من پێم وابووکە شکست تەنها نائومێدی دروست دەکات.

کەسی دانا: لە ڕاتی دا شکست بوونی نیە، لەبەر ئەوەی لە ڕێگەی باڵا بوونمان دا گشت شتێك بوونی هەیە، هەروەها ووتی ئەی باران بوونی نیە؟

گەنجە کە ووتی: بەڵێ

کەسی دانا: ئەی با بوونی نی یە؟

گەنجەکە: بەڵێ.

کەسی دانا :ئەی هەورە بروسکە؟

گەنجەکە : بەڵێ.

کەسی دانا: ئەی زەمین لەرزە؟

گەنجەکە : بەڵێ.

کەسی دانا: ئەی نەخۆشی؟

گەنجەکە: بەڵێ.

کەسی دانا: ڕەنگە لە دەرەنجامی نان خواردنیش دووچار بە ژەهراووی بوون ببیت.

گەنجەکە: بەڵێ.

کەسی دانا پرسی: کاتێك لەخواردنەوە دووچاری ژەهراووی بوون بوویت، بەتەواوەتی لە خواردن دوورکەووتیتەوە؟

گەنجەکە: بەدڵنیاییەوە نەخێر.

کەسی دانا: بۆچی؟

گەنجەکە: لەبەر ئەوەی بەو کارە ئەمرم.

کەسی دانا: هەمان شت دروستە لەسەر ڕێگای باڵا بوون، لەبەر ئەوەی هیچ ڕێگرێك ناتوانێت تۆلە جوڵە بخات.

کەواتە شکست پێویستە بۆ سەکەوتن، لەڕاستی شکست نی یە بەتەواوی مانا بەڵکو ئەوەی کە هەیە بریتی یە لە ئەزموون و کارامەیی و شارەزایی بەڵام تۆ تەنها ئیشێکت کردووە (کورتە وەستان) بۆ ئەوەی بیر بکەیتەوە و هەڵسەنگاندن بکەیت.

دووبارە جارێکی دیکە هەڵدەسیتەوە بەکاری هەڵسەنگاندن و چاککردن و فێر کردن، دواجار هیچ کەسێك ناتوانێت شارەزایی و زانیاری و هێز و لێ هاتوویت بەرێت بۆ خۆی لەبەر ئەوەی بووە بە

شتێك له تۆ و تۆش بوویته بەشێك لەئەو، كاتێك كه لەسەر ڕێگای والآبوون كار دەكەیت و ئەگەرەكان دەخەیته پێش چاوی خۆت....

هەوەرك ئەبینین تۆ هەموو شتێكت خسته بواری كارەوه وەك: لەبەر چاوگرتنی هۆكارەكان، پشت بەستن به دروستكەری هۆكارەكان، پەیوەندی كردن به خواوەندەوه، زانیت كه جیاوازی چی یه له نێوان خەون و ئامانج و مەبەست و كاری ستراتیجی، هەوەرها زانیت كه چۆن ئەوشتانه بخەیته بواری كارەوه و نەیخەیته هیچ بوارێكی دیكەوه.

گەنجەكه ووتی: كەواته كۆتایی ڕێگەی باڵا بوون چی یه؟

كەسی دانا: ڕێگەی باڵا بوون بەوه دوایی نایەت كه پێی بگەی، كاتێك كه دەگەیته كۆتایی تازه دەگەیته سەرەتایەكی نوێ، كۆتایی سەرەتایه بۆ دەست پێكێكی نوێ، كاتێك ئەوەش كه دەست پێ دەكات كۆتایی دێت، دووباره سەرەتایەكی نوێ دەست پێدەكات، بەم شێوەیه دەبێت تا دوارۆژی ژیان. ئێستا ڕێگه بده با باس له ئەگەرەكانی بكەین له هەنگاوەكانی پلان دانان. تۆ بیر له سەرجەم ئەو ڕێگرانه دەكەیتەوه كه ڕەنگه بێنه سەر ڕێگەت و پێشتر بیر له چارەسەر كردنیان دەكەیتەوه، كاتێك كه تۆ پێشتر هەست به كێشەكان دەكەیت هەر زووتریش بیر له چارەسەر كردنیان دەكەیتەوه، تۆ له ڕێگەی باڵا بوون دا كاتێك كه دوچاری كێشەیەك دەبیت، بەتەواوەتی پێشتر خۆتی بۆ ئاماده دەكەیت لەبەر ئەوەی ئەی ناسیت و خۆتت بۆ ئاماده كردووه.

گەنجەکە پرسیاری کردو ووتی: ئایا شتێك هەیە من چاوەڕوانیم نەکردبێت و شارەسەرم بۆ دەنەنابێت؟

کەسی دانا ووتی: بەڵێ. تۆ پلانت بۆ ئەو ئەگەرانە داناوە کە دەیانزانیت و بۆئەو ئەگەرانەش کە نایانزاینت.... بۆچی؟ لەبەر ئەوەی تۆ ئەزانیت کە لەڕێگەی بالاّ بوون دا چەند ئەگەرێك دێتە ڕێت، هیچ بوونەوەرێکیش لەسەر گۆی زەوی نی یە کەگشت ئەگەرەکان بزانێت و پەی بەگشت ڕێگرەکان بەرێت، لەبەر ئەوە خواوەند هەنگاو بە هەنگاو فێرمان دەکات، وەکاتێکیش کە ئامانج دەپێکیت و ئەگەیتە سەر ڕێگەی دروست لە خواوەند زیادتر نزیك دەبیتەوە، ئەوکاتە تۆ بە تەواوەتی فێر بوویت و خواوەند دەناسیت وهەست بەجوانی و میهرەبانیەکەی دەکەیت. کاتێك و کاتێك ئاوڕ لە ڕابووردو دەدەیتەوە وئەبینیت چی ڕووی داوە، ئەبینیت کەڕۆژێك لە ڕۆژان ئازاری داویت، ئێستا دڵت خۆش دەکات، کەواتە ئەم ووتە بەنرخە فێر بە ئەی کوڕێ گەنج: هەندی٢جار لە ڕابوردوو ئەنواڕی و ئەبینت کە بەئازارە، هەروەها سەیری داهاتوو دەکەیت و ئەبینیت کە تاریکە بەلاّم تۆ لە ناخت بنوارە و پشت بە خواوەند ببەستە بەو پەڕی خۆشەویستی یەوە، دواتر جارێکی دیکە وورد بەرەوە ئەبینیت کە ڕابوردوو دڵ خۆشکەرە و داهاتووش ڕۆشنە. ئەمەیە ڕێگای بالاّ بوون بەم شێوەیە ئێمە خەریکین دەگەینە کۆتایی، دواتر پێ کەنی و لێرەدا گەنجەکە پێ کەنی و ووتی: کام کۆتایی ؟

کەسی دانا ووتی: ڕێك کەووتین لەسەر ئەوەی کە کۆتایی ڕێگا، سەرەتایەکی نوێ یە بۆ ڕێگەیەکی نوێ، هەموو کۆتاییەك سەرەتاییەکی هەیە، هەموو سەرەتایەکیش کۆتاییەکی بەردەوامی هەیە لەکات دا، کەواتە بابگەینە کۆتایی ئەم بیرۆکەیە، ئەویش کارامەیی تەواوەتی یە، کۆتایی ئەو بیرۆکەیەش کەبە دوایدا دێت کرداری ستراتیجی یە، کۆتایی ئەو بیرۆکەیش کەبەدوایدا دێت دانانی ئەگەرە بۆ هەموو شتێك لێرەوە، باپێکەوە بڕۆین تا دەگەین بە ڕێگەی والآبوون. بۆ ئەوەی بگەین بە ڕێگرە سەرەکی یەکان، ئەو ڕێگرانەی کە ڕەنگە لەسەر ڕێ لات بدەن. ئەی کوڕی گەنج من ئەو شتانە ناو دەبەم بە دزەکانی ژیان، یاخود دزەکانی سەر ڕێی باڵآبوون، یەکەمین دزیش ئەو کەسەیە کە کە سوێندی خواردووە بە گەورەیی خوا کە لەسەر ڕێی ڕاست لامان بدات. سورەتی عراف ئایەتی ١٦ ، کە ئەویش ئەهریمەنە.

پێویستە ئەوە بزانیت کە ستراتیجیەتی ئەهریمەن پێك دێت لەسەر سێ بەشی سەرەکی .

بەشی یەکەم: کار دەکات لەسەر ئەوەی کە هاوبەش بۆ خواوەند پەیدا بکەیت. خەڵکی بی ئەوەی بەئاگابن هاوبەش بۆ خواوەند دروست دەکەن. بەبێ ئەوەی بزانن دەڵێن: من پشتم بە خواو و بەتۆ بەستووە ئەم کارەش هاوبەش پەیدا کردنە لەبەر ئەوەی تۆ کەسێکی ئاسایی دەخەیتە ئاستی خواوەندەوە لەبەر ئەوە ئاگادار بە و تەنها پشت بەخواوەند ببەستە، دواتر ووتی: من بڕوای تەواوەتیم پێتە .

دروست کردنی هاوبەش بۆ خواوەند، بە تەواوەتی لە ووزەی ڕۆحانی دوورت دەخاتەوە، زۆر کەس پێیان وایە کە هۆکارەکان ئەم حاڵەتە دروست دەکەن.

بەشی دووەم: گەر نەتوانێت لە خشتەت بەرێت لە گەێ ڕایەڵی دوورت دەخاتەوە.

گەنجەکە پرسی : چۆن؟

کەسی دانا وەڵامی دایەوە: چیرۆکێك هەیە کە نوسەرەکەی شێخ شعراوی یە( خوای لێ خۆش بێت)، کاتێك کە قسە لەگەڵ ئەبی دەردا دەکات دەڵێت: کە هەموو شتێکی دۆڕاندووە و کۆی سامانەکەی لە شوێنێك دا داپۆشیوە و نازانێت لە کوێ یە. داوای لەم ئەولیایە کردووە کە وەڵامی بداتەوە و داوای یارمەتی لە ئەبو دەردا ئەکات، ئەویش پێ دەڵێت: من چۆن ئەتوانم ئەوکارە بکەم، بەڵام ئەوەی دەتوانم بە تۆی بڵێم ئەوەیە کە بەیانی بەیاری یەزدان لەکاتی نوێژ کردن دا بە نیەتێکی پاکەوە داوا لە خواوەند بکە ڕێت ڕووناك بکاتەوە بۆ ئەوەی بیدۆزیتەوە.

کەسە کە سوپاسی کردو ڕۆیشت، بۆ ڕۆژی دوایی زوو لە خەو هەڵسا و چوو بۆ مزگەوت بۆ نوێژ کردنی بەیانی، لەکاتی ڕێ کردنی دا بۆ مزگەوت بیری کەوتەوە کەلەکوێ پارەکەی داناوە، زۆربە خێرایی چوو بەرو شوێنەکەو هەڵی گرتەوە، زۆر خۆشحاڵ بوو دووبارە گەڕایەوە بۆ لای ئەبی دەردا و پێی ووت: دۆزیمەوە، دۆزیمەوە.

ئەبو دەردا بەپێکەنینەوە پێی ووت: نوێژی بەیانیت کرد؟ کەسەکە بە خەمەوە سەیری کردوو ووتی: نەخێر ئەبو دەردا ووتی: زانیم کە ئەهریمەن ئەم شەو وازت لێ ناهێنێت.

بەمە دەوترێت دوورکەوتنەوە لە گوێ ڕایەڵی، کەواتە لە خۆتی دوور بخەرەوە وتەنها سەرنج لەئامانجەکەت بدە زۆرجار ئەهریمەن رووکەشێکی دروست دەکات بەبەر کارە نادروستەکانی دا، بۆنمونە کاتێك کە نوێژ دەکەیت ڕەنگە بیرۆکەیەکت بۆ بێت کە ڕێگەی بە دەست هێنانی ئامانجەکانت بۆ ڕوون بکاتەوە، ئەمەش بیرۆکەیەکی پۆزەتیڤە بەڵام ئەمە کاتی ئەجۆرە بیرکردنەوەیە نیە، لەبەر ئەوەی تۆ لە پەیوەندی دایت لەگەڵ خواوەند دا، لێرە کاتێك کە نوێژ دەکەیت دەبێت خۆت بپارێزیت لە بیرۆکە پۆزەتیڤ و نێگەتیڤەکان و لە هەر بیرۆکەیەك کە دوورت بخاتەوە لە نوێژ کردن وگەیشتن و پەیوەندی کردن بەخواوەندەوە، لێرەدا بیرکردنەوەی پۆزەتیڤانە لە دژی تۆ کار دەکات. بیر کردنەوە لێرەدا بیرکردنەوە نی یە، لەبەر ئەوەی ئەهریمەن دوورت دەخاتەوە لە ووزەی ڕۆحانی و پەیوەندی کردن بە خواوەندەوە، ئەهریمەن لە گوێ ڕایەڵی کردن دوورت دەخاتەوە و کار دەکات لەسەر ئەوەی کە تۆ زیادتر جەخت لەسەر بەدەست هێنانی ئامانجەکان و خەونەکان و داهاتەکانت بکەیتەوە، هەروەها لە ژیان دەتترسێنێت و کار دەکات لەسەر ئەوەی کە هەست بە ئاسایش نەکەیت.

بەشی سێهەم: گەر نەیتوانی لە خشتەت بەرێت، دوورت دەخاتەوە لە گوێ ڕایەڵی کردنی خواوەند و کار دەکات لەسەر ئەوەی کە گومان بکەیت بۆ نمونە: کاتێك کە دەست نوێژ دەگریت، گومان دەکەیت لەوەی کە ئایا دەست نوێژت گرتووە یان نەخێر؟

یاخود بەشێوەیکی دروست دەست نوێژت گرتووە؟

کاتێکیش کە نوێژ دەکەیت وات لێ ئەکات کە گومان بکەیت لەوەی کە تۆ دوو ڕکات نوێژت کردووە یاخود ڕکاتێك یاخد چیت وتووە؟ هەروەها بیرت پەر تەوازە دەکات و نایەڵێت بە دروستی کارەکەت ئەنجام بدەیت. ئەمەیە ستراتیجیەتی ئەم دزە، سەرەتا لە خشتەت دەبات، گەر نەی توانای ئەم کارە بکات هەوڵ ئەدات لە گوێڕایەڵی دورت خاتەوە، گەر ئەم کارەشی نەتوانی هەوڵ ئەدات زەینت پەرێشان بکات و بیرکردنەوت پەرتەوازە بکات لەکاتی پەیڕەوی کردن لە خواوەند. ئەم پەرتە وازەییە لە خواوەند دوورت دەخاتەوە، ئەم ڕەوشە بەدرێژایی کات بەردەوام دەبێت و ئەهریمەن وازی لێ ناهێنێت تاتۆ لەسەر ڕێگەی بالآبوون بیت لەبەر ئەی دەزانێت کە تۆ لەخواوەند نزیك دەبیتەوە، ئەهریمەن لەو دوژمنە سەر سەختانەیە کە خواوەند ئاگادارمان دەکاتەوە لێی. ئەهریمەن تا ڕۆژی کۆتایی بەردەوام لەسەر کارەکەی دەبێت لەبەرئەوە پێویستە بزانیت کە کێ یە، ڕەنگە هەندێك خەسڵەتی وەك خۆ بەگەورەیی زانی لێوە فێر بیت وهەست بە گەورەیی بکەیت لەبەر ئەوی تۆ شتێکت کردووە کە ئەوانی دی نەیان

توانی وە بیکەن. لە نێوان خۆ بەزل زانی و باوەڕ بەخۆ بووندا جیاوازییەکی زۆر سادە هەیە، کەسی خۆ بەزل زان تەنها خۆی دەبینێت و دەکەوێتە داوی خودی خوارینی و هەمیشە باس لە خۆی دەکات، ووشەی من زۆر بە بەرز دادەنێت، کەسی خۆ بەزل زان ئەوانی دی بە کەمتر لە خۆی سەیر دەکات. خۆی بەسەرتر لە خەڵکی دەزانێت لەبەر ئەو دەسکەوتانەی کە بەدەستی هێناوە. بەم شێوەیە ئەهریمەن دووری دەخاتەوە لە پەرستنی خواوەند، کەسەکە بەم ڕەوشە و بەم خۆبەزل زانی یەوە خەسڵەی ئەهریمەن وەردەگرێت، لەبەر ئەوەی دەڵێت: من باشترم لەوان، من لە ئاگر دروست کراوم ئادەم لە قوڕ دروست کراوە و دەستی کرد بە خۆ بەزڵ زانی، لەبەر ئەوەش بوو کە خواوەند لە زەوی یەکەی خۆی دەری کرد، بۆیە ئاگات لە خۆ بەزل زانی بیت. بەڵام گەر بێت و باس لە باوەڕ بەخۆ بوون بکەین، ئەوا دەڵێین ئەوکەسەی کە باوەڕی بە خۆیەتی، کەسێك دەبێت زۆرسادە و زۆر نەوی. ئەم کەسە دەتوانێت بگاتە گشت کەسێك و بێتە ئاستی هەر مرۆڤێك، گەر کەسێکی سادە داوەتی خواردنێکی کردیت، بەخۆش حاڵیەوە قەبووڵی دەواتەکەی بکە گەر کراش لەسەر زەوی لەگەڵی دانیشە، بەهەر شتێك کە بۆت دەکرێت خۆشحاڵی کە، سادەیی لە گشت شتێکا بوونی هەیە، لەخۆردا دەی بینیتەوە کاتێك کە بەرۆژدا هەڵ دێت، زۆر بە سادەیی تۆ دەرکەوتن و هەڵهاتنی خۆر دەبینیت، هەوەرها زۆر بەسادەیی مانگ و ئەستێرەکان دەبینت، زۆر بە سادەیی هەموو شتێك لە بورای خۆی دا



Scanned with CamScanner

دەبینیت، هەر شتێك كە خواوەند دروستی كردبێت، لەبەر ئەە كە بالآ مرۆڤێكی زۆر سادەیە. بە ئەندازەیەك كەهەر بە خەیاڵتا نەیەت.

گەنجەكە پێ كەنی ولەكسی دانا نزیك بۆوە دەستی ماچ كرد، ووتی: هەروەك تۆ ئەی كەسی دانا، تۆ بە درێژایی ئەم ماوەیە زانیاری بەبێ بەرامبەر بەمن دەبەخشیت، منیش لە تۆوە ئەم سادەییە فێر بووم.

كەسە كەوەلآمی دایەوە و ووتی: خوایە بە دوورمان كەیەت لە ئەهریمەن تۆ داوا لە خوا بكە كە یارمەتیم بدات بۆ ئەو شتەی كە ووتت، ئەوشتەی كەمن دەی بەخشم، لەڕاستی دا دەی بەخشم بەخواوەند، من تەنها هۆكارێكم كە خوا خواستی لەسەر بووە كە بكەومە سەر ڕێت بۆەئەوەی بالآ بیت. ئەوە بزانە ئەی كوڕی گەنج كە خوا تۆی خۆش دەوێت و خوازیارە كە بالآ بیت. لەبەر ئەوە زیاد لە خوا نزیك بەرەوە. دواتر سەیرێكی كردوو ووتی: دوای خۆ بەزل زانینیش سەرە دێتە سەر خۆویستی.

خۆویستی، بریتیە لەو خودە نزمەی كە لە ناخماندایە، ئەمەش بەو مانیە دێت كەجگە لە تۆ كەسی دیكە بوونی نیە، پارە هی تۆیە بیرۆكەكان هی تۆیە، هەموو شتێك هەڵ دەگریت بۆخۆت، ئەوانی دییت خۆش ناوێت تەنانەت گەر تۆ خێرو خۆشیت بۆ ئەوانی دیش بووێت ئەوا تۆ جگە لەخۆت كەسی دیكە نابینیت، ئەمە پێی دەڵێن خۆویستی، خۆویستی بریتی یە لەوەی كە مرۆڤ خۆی لە هەموو شتێكا ببینێتەوە و حەز نەكات هیچ شتێكی خۆی ببەخشێت لەبەر ئەوەی ئەو كەسە

خۆویستە ئەبینێت لەسەر خوان لەهەموان زیادتر نان دەخوات، لە هەموان زیادتر دەمێنێتەوە، لە هەموان زیادتر گرنگی بە خۆی دەدات، گرنگی بە هەست و سۆزی ئەوانی دی نادات، گرنگی بە هیچ شتێك نادات. ئەم خۆویستی یە کار دەکات لەسەر دوورخستنەوەی خەڵکی لێی و دەرەنجام ئەو کەسە هەست بە تەنهایی یەکی کوشندە دەکات تەریك دەبێت لە ناو کۆمەڵگادا. بزانە کە وون بوون لە ناو هۆکارەکاندا هۆی کەی دەگەڕێتەوە بۆ زانستی سەردەم و ئەو پێش کەوتنە خێرایەی کەلە دەوروبەرماندا ڕوو دەدات هەروەها دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ململانێ یەی کە لەهەر ساتێك لە ساتەکاندا دروست دەبێت لە کاتی ڕەخسانی هەلەکاندا. ئەبینین کە مرۆڤ وون دەبێت کە هۆکارەکان و بابەتگەلەکانی گەردوون و جیهان، من تۆم خستە دواوەو کاتێك کە داوام لی'کردێت کە هەموو شتێك دابنێیت تۆش هەموو هۆکارەکانت لە بەرچاو گرت لەبەر ئەوەی بە دەستی بهێنیت، دواتر خۆت بینیەوە کە هیچت بە دەست نەهێنانەوە لەبەر ئەوەی نەگەڕاویتەوەتەوە سەر دروست کەری هۆکارەکان. لەڕێگەی باڵا بوون دا پشت بەستن بە خواوەند لەناو دل'دایەو تۆش بەردەوام لەناو دڵت دا پشت بە خواوەند دەبەستیت و ئەو هۆکارانە بەکار دەهێنیت کە پێت دەبەخشێت کاتێکیش کە هۆکارەکان بەکاردەهێنیت پشت بەخواوەند دەبەستیت و زۆر بە پی'زانینەوە سوپاسی دەکەیت. لەبەر ئەوە ئەو بوون بوونەی لە دنیادا هەیە هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ لەبەرچاو گرتنی هۆکارەکان



Scanned with CamScanner

و پشت بەستن بەتەکنۆلۆجیا، باوەڕیش وایە کە سەرکەوتن بەم شێوەیە دەبێت، لەبەر ئەوە زۆر ووریابە لە پێشکەوتنی خێرا و وون بوون تیایدا هەر کاتێك کە داهێنانێکت پێش چاو کەوت کە پارێدەدەرت بوو لەپێش کەوتندا دەست بەجێ بگەڕێرەوە سەر دروست کەری هۆکارەکان کە تواناى بیرکردنەوە و داهێنانی پێ بەخشیویت. سوپاسی بکەو پشتی پێ ببەستە چونکە ئەو هۆکارانەی بۆ ڕەخسانوویت هەروەك لە نوسراوەکاندا هاتووە کە خواوەند دەفەرموێت: ﴿بەندەکەم، بەگوێم بکە، تا کارێك بکەم ببیتە بەندەیەکی پیرۆز و هەز شتێك کە بڵێی ی بەو شێوەیە بێت﴾. لێرەدا ڕێگە بدە کەئەم ڕستە پڕ بەهایەت بۆ لێك بدەمەوە:

بەندەکەم: ئەمە دیاری کردنە ڕەنگە بکرایە بوترایە: ئەی بەندە.

بەلاّم خواوەند دەفەرموێت بەندەکەم هەرەك چۆن دەڵێیت خوایە یاخود دەڵێیت کچەکەم، ئەم جۆرە ناوهێنانە جۆرێك لە گەورەیی و دیاری کردن دەبەخشێت بەو کەسەی کەلە بەرامبەرت دایە.

بەگوێم کە: تۆ دەڵێت: بۆچی خوایە؟ خواش پێت دەڵێت: لەوەی کە نەهیم لیْکردووە دوور بکەوەرەوە لەوەش کە فەرمانم پێ داوە نزیك بکەوەرەوە هەر شتێکم کە لێت داواکردووە بەگوێم بکە بەتەواوەتی بە گوێم بکە دەتکەمە بەندەکی پیرۆز. لەبەر ئەوەی ئەوە خواوەندە کە دەڵێت: ببە دەبێت کەواتە ئەتکاتە بەندەیەکی پیرۆز. پەیامبەر و نێردراوەکانی خواوەن کەسانی پیرۆز بوون هەر کاتێك بەشتێکیان



Scanned with CamScanner

بووتایە ببە، ئەبوو. هۆکارەکانی خستبووە دەستیان، تیایاندا هەبوو کەبەسەر ئاودا ڕێی دەکرد، تیایادا هەبوو کە مردووی زیندوو دەکردەوە تیایاندا هەبوو کە قسەی لەگەڵ بڵدارو مێرو و ڕووەکدا دەکرد، ئەهریمەنی خستبووە خزمەتیانەوە تیاشیاندا بووە کە موعجیزەی قورئانی پیرۆزی پی بەخشیبوون کە بەردەوام دەبێت تا ڕۆژی کۆتایی. یەزدان هۆکارەکانی گەردوون، یاساکانی ئەم دنیایە و یاساکانی پێکەوە گونجانی ئەندێشەکان خستۆتە بەر دەستت.

لێرەدا کەسی دانا لە گەنجەکەی پرسی: ڕۆژێك لە ڕۆژان ڕووی داوە کە بیرت لە کەسێك کردبێتەوە دواتر ئەو کەسە پەیوەندی پێوە کردبێتیت، یاخود لەبەردەم خۆت دا بینیبێتت ئەویش پێت بڵێت: منیش هەروەها بیرم لی دەکردیتەوە؟

یاسای گونجانی ئەندێشەکان و یاسای کێش کردن بریتی یە لەوەی کە بیر لەشتێك بکەیتەوە و دواتر ببینی کە ئەو شتە ڕوو دەدات. یاسای گەڕانەوەش بریتی یە لەوەی کەبیر لە شتێك بکەیتەوە و ئەو شتەش بۆ لات بگەڕێتەوە. ئەبینیت ئەی کوڕی گەنج چۆن خواوەند یاساکانی هێزت بۆ دەخاتە بەر دەست، کاتێك بیر لە ئامانجێك دەکەیتەوە ئەو ئامانجەش بیرت لی دەکاتەوە، کاتێك بیری لی دەکەیتەوە ئەو شتە دێتە ناو زەینتەوە، کاتێك کە دەی نوسیت لەویژدانت دا بوونی دەبێت، کاتێکیش کە وونی دەکەیت، دەبێتە بەشێکی دانەبڕاوی لە تۆ کە هەر دەبێت بە دەستی بهێنیت لەبەر ئەوەی ئەو ئامانجە

ئێستا خاوەن ووزەیە، بۆ نمونە کاتێك کەژن سکی هەیە منداڵ دوای تێ پەڕ بوونی (٩) مانگ لە دایك دەبێت جا لەهەر بار دۆخێکدا بێت وەهیچ ژنێك ناتوانێت بڵێت من بۆ ماوەی سێ مانگی تر ئەو منداڵە لەناو هەناومدا هەڵگرم. هەمان یاسا بەسەر ئامانجدا دەسەپێت لەبەر ئەوەی کاتێك کە ئامانجەکەت ئامادە دەبێت پێویستە لە دایك بێت و بێتە ناو ژیانەوە گوێ بەم ووتە بەنرخە بدە ئەی گەنج: ئەوەی کەلەناو دڵمدا هەیەو لەناو خوێنمدا لە جوڵە دایە، دەبێت بێتە ناو ژیانەوە، ئەمە ئەو ئامانجەیە کە بەشێکی دانەبڕاوە لە خەون. هەوەرها لە دزەکانی سەرکەتن دەتوانیت باس لە بەڵێنی درۆ بکەین:

## بەڵێنی درۆ

کەسی دانا لە چاوی کوڕە گەنجەکە وور بۆوەو ووتی: فێربە ئەی کوڕی گەنج کە هیچ کات بەڵێنێك بە کەسێك نەدەی کە نەتوانیت بیبەیتە سەر، ئەو ئایەتە پیرۆزەی خواوەندت لە یاد بێت کە دەفەرموێت: ﴿ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە بۆ شتێك ئەڵێن کەناتوانن بیبەنە سەر، زۆر ناشرینە لەلای خوا کەشتێك بڵێن و کاری پێ نەکەن. "سورەتی صەف ئایەتی ٢ – ٣". لەبەر ئەوەی ئەم کارە درۆیەکی گەورەیە لەلای خواوەند بۆیە پەیمان بە کەسێك مەدە کە نەتوانیت بیبەیتە سەر. بۆنمونە بەکەسێك بڵێیت کە کاتژمێر سێ دەتبینم و دوای کاتژمێرێك بچیت، وای دابنێ کە ئەو کەسە لە ماوەی



Scanned with CamScanner

ئەو کاتژمێرەدا گیانی لە دەست بدات، ئەوکاتە هەستت چی دەبێت؟ بۆچی ئەو کەسە ماوەی کاتژمێرێك چاوەڕوانت بکات ئەو کەسە کاتژمێرێك لە تەمەنی دەڕوات و هیچ ناکات. سزای خۆت بۆ ئەم کارە لای خوا بهێنەرە پێش چاو، بە بەردەوامی کات داوا بکە بۆ بیرکردنەوە و کاتێکیش کە بەڵێن دەدەیت بیبەرە سەر.

گەنجەکە ووتی: ئەم قسەم لێ وەربگرە ئەی پیاوی دانا: من لەمەو دوا بەڵێن بە کەسێك نادەم گەر نەتوانم بیبەمە سەر، بگرە زیادتر لەوکارە دەکەم، کاتێك بەڵێن بە کەسێك دەدەم وەسیەت نامەش دەنوسم لەبەر ئەوە گەر هاتوو من مردم کەسێکی تر هەبێت کە بەڵێنەکە بەرێتە سەر. کەسی دانا پێکەنی ووتی: خواپیرۆزت کات بەیاری یەزدان تۆ دەگەیتە بەرزترین ئاستەکانی پێش کەوتن و سەرکەوتن لە ڕێگای باڵا بوون دا، لەبەر ئەوەی ئەمەیە ڕێگای باڵا بوون .

لە دزەکانی دیکەی ڕێگەی باڵا بوون درۆیە.

<u>درۆکردن:</u> هەل و مەرجی ژیان هەر چی یەك بێت هیچ کات درۆمەکە. درۆ لە زمانت دووربخەرەوە، لەبەر ئەوەی گەر ڕۆژێك لە ڕۆژان درۆ بکەیت، ئەهریمەن یارمەتیت دەدات کە زیادتر و زیادتر درۆبکەیت و ببیتە پیشەگەر لە بواری درۆکردن دا. بە هیچ شێوەیەك درۆمەکە بەشێوەیەك بیر بکەرەوە کە ستراتیجی بێت. ڕاستی هیچ شتێکی دیکە مەڵێ وە ئەوەشت لەیاد بێت کە بەپەیامبەری پیرۆزمان



Scanned with CamScanner

دەوترا ڕاست گۆی باوەڕ پێ کراو، سەرەتا ڕاست گۆ و دواتر باوەڕ پێ کراو، لەبەر ئەوەی ئەو لەکاتی قسەکردندا ڕاست گۆ بووە و دەست پاك بووە لەکاتی مامەڵە کردن لەگەڵ خەڵکی دا، تۆ پێویستە کە بەڵێنەکانی خۆت ببەیتە سەر هەر کاتێکیش کە شتێکت دەکەوێتە لا، بیدەیتەوە بە خاوەنەکەی جا ئەو خاوەنە موسڵمان بێت یا مەسڵمان نەبێت، باوەڕدار بێت یاخود بی'باوەڕ لەبەر ئەوەی ئەو کەسە خاوەنی هەقە، هەروەها مەڵێ: ئەمە هەقی منە، لەبەر ئەوی ئەو شتە هەقی تۆ نی یە تۆ پارەیەکت هەڵگرتووە بۆ خۆت کە کەسێکی تر خاوەنیەتی، بۆ ئەو کارە لەلایەن خواوەندەوە سزا دەدرێیت. دڵنیاش بە تا پارە لە ڕێگەی حەلاڵەوە بەدەست بهێنیت زیادترت بەدەست دەکات. هەل و مەرج هەرچی یەك بێت درۆمەکە دەست بۆ شتێك مەبە کە هی خۆت نەبێت، تەنها دەست بۆ شتێك بەرە کە شایانی بیت، هیچ کات خۆت بەسەر خەڵکی دا فەرز مەکە. ئەوەت لەیادبێت کە تۆ لە ڕێی بالاْ بوون دا خەڵکی زۆر دەبینیت، تەنها ئەو پارەیە هەڵگرە کە خواوەند لێی ڕازیە، دڵنیابە خواوەند پرسیاری ئەو پارەیەت لی'ئەکات کە هەڵی ئەگریت، ئەگەر سەرچاوەی پارەکەت حەلاڵ بێت و لەکاری حەرامدا خەرجی بکەیت لێ پرسینەوەت لەگەڵ دا دەکرێت، وەئەگەر سەرچاوەی پارەکە حەرام بێت و لە بواری حەلاڵدا خەرج بکرێت ئەوا تۆ بەشی خۆت لەم دنیایەدا وەردەگریت، ئەو کەسەی لە ڕێی حەلاڵەوە پارەکە دەست دەخات چێژ لەوپارەیە وەردەگرێت، بەلاْم گەر هاتوو



Scanned with CamScanner

سەر چاوەکە حەرام بوو بێ گومان سزاکەی دەدەیت لەبەر ئەوە باشتر وایە کەسەرچاوەی پارەکەت حەلاڵ بێت. ئاگاداری جیاوازی نێوان داهات و سوود بە هەروەها ڕزقی حەلاڵ و ڕزقی حەزم، ڕزقی پیرۆزو ڕزقی نا پیرۆز.

گەنجەکە سەیرێکی کردوو پێی ووت: خواوەند ئاگای لە خۆت ولە کارەکەت بێت ، دواتر ووتی جیاوازی چی یە؟

کەسی دانا وەڵامی دایەوە: سوود ئەوەیەکە تۆ گەر کۆمپانیایەکت هەبێت و (١٠٠) دۆلار سوودی کردبێت، داهاتی تۆش لەو برە پارەیە (٢٠٠٠٠) بێت لەو پارەیەش (٢٠٠٠) دابێت بە دایکت و باوکت و (٢٠٠٠) یش دابێت بە منال و خوشك وبرا و خێزانەکەت، هەندێك قەرز و هەندێك زرەریشت لێ دابێتەوە، لە دواجار دا لەو برە پارەیەی سەروە کە (٢٠٠٠٠) بوو تەنها(٥٠٠٠) بۆ خۆت مابێتەوە، ئەوە دەبێتە ڕزقی تۆ.

ڕزقی پیرۆز ئەو ڕزقەیە کە خواوەند ئەو خەرجی یەی کە زۆر پێویست نەبێت لێتی دوور دەخاتەوە؟ ڕزقی نا پیرۆزیش بریتی یە لەوەی کە بڕی (٥٠٠٠) هەر لەسەرتای (١٥) ڕۆژی یەکەمدا خەرج بکەیت و باقی مانگە کە بە قەرز ببەیتەسەر، بەڵام خواوەند لە ڕزقی پیرۆزدا سەرجەم ئەو خەرجیانەی کە پێویست نین لێت دوور دەخاتەوە. بۆیە خۆت وەك کەسێکی ڕەزامەندو ئاسوودە دەبینیتەوە و دەتوانیت پاشەکەووتیش بکەیت لەو برە پارەیە، ئەو برە پارەیەش هەم دەستکەوتە و هەم داهاتە و هەم ڕزقی حەلاڵ، ئەوحەلاڵەی کە



Scanned with CamScanner

خواوەند پێی بەخشیویت، ڕەزامەندت دەكات و دەڵێیت: سوپاس بۆ خواوەند، هەل و مەرج هەرجۆرێك بێت لە ڕزقی حەرام دوور دەكەویتەوە بۆ نمونە مرۆڤێك پێت دەڵێت ئەو (١٠٠٠٠) وەربگرە لەبەر ئەوەی بەشی تۆیە. تائەو كاتەی كە تۆ پێوەی ماندوو نەبوویت وەری مەگرە، لەبەر ئەوەی ئەو پارەیەی جۆرێكە لە بەرتیل، تۆش هەر بە دیداری خواوەند دەگەیت، ئەمڕۆ نەبێت بەیانی، ئایا تۆ ئامادەیت؟ كەواتە خۆت بەدووربگرە لە داهات و قازانجی حەرام، لەبەر ئەوەی ڕزقی خۆت لە گەڵ خۆت دایە .

ڕزقی پیرۆز دورت دەخاتەوە لەو مەسرەفانەی كە پێویست نین، بەڵام ڕزقی حەرام دەتخاتە كاری بەراوردكاری لە نێوان ئەوەی تۆ هەتە و ئەوەی كەسانی تر هەیانە، ئەو كاتەش هەست بە نائومێدی دەكەیت و دەڵێیت من چانسم نی یە. توشی بەغالەت دەبیت و ئێرەیی بە خەڵكی دەبەیت، تەنانەت لە كاتی خەوتنیشا تۆ هەر بەم شێوەیە دەبیت.

گەنجەكە ووتی: سەبارەت بە دزەكانی سەركەوتن هیچی تر ماوە؟

كەسی دانا وەڵامی دایەوە: دز زۆر هەن، بەڵام تۆ لە ڕێگەی باڵابون دا یەك لە دوای یەك پێیان دەگەیت. كەم پشوویش یەكێكی ترە لەو دزانە.

کەم پشوویی: گەر پشوو درێژنەبیت، هیچ شتێك بەدەست ناهێنیت، پشوو درێژی کارێکی باشە بەڵام بە مەرجێك کە هۆکارەکان لە بەرچاوبگریت و پابەند و بەردەوام بیت لە هەموو هەل و مەرجێك دا.

گەنجەکە ووتی: بێ پشووی؟ دوای ئەو هەموو کارەی کردم هێشتا نەگەیشتووم بەوەی کەدەمەوێت؟

کەسی دانا ووتی: لە کاتی گونجاودا و کاتێك کە خواوەند بڕیار دەدات کە ئەو کاتە کاتی گونجاوە، لەبەر ئەوە پێویستە کە پشوو درێژ بیت، تۆ ئەوەی کەلە تواناتدا بووە کردووتە و تائێستاش هیچ شتێك دیار نیە، لەبەرئەوە پشوو درێژبە چونکە خواوەند کەسی پشوو درێژی خۆش دەوێت.

ئەی بەندەکەم بەگوێم کە، ئەتکەم بە بەندەیەکی پیرۆز و بە هەرشتێك بڵێی ببە، دەبێت.

خواوەند حەز دەکات لە هەر کارێکدا کە دەتەوێت بیکەیت بە ناوی ئەو دەست پێ بکەیت.

﴿خواوەند ئەو کەسانەی خۆش دەوێت کە پشتی پێ دەبەستن﴾ "سورەتی عمران ئایەتی ١٥٩".

گەنجەکە ووتی: ئەگەر پشوو درێژ بم ئیتر کۆتاییە؟

کەسی دانا: هەروەك پێشتر پێم ووتی: کۆتایی ڕێگا بریتیە لەسەرەتای ڕێگایەکی نوێ، کۆتایی ئەو ڕێگایەش سەرەتای ڕێگایەکی نوێ یە، تا کۆتایی یەکجارەکی ئەم جوڵەیە بەردەوامە و ناوەستێت، ئایا



Scanned with CamScanner

ئاین بە مردنی پەیامبەر کۆتایی پێ هات، ئەوەی کە خواوەند پێتی بەخشیبوو لە زانست و شێواز و ئاکار و ڕەوشەکەی بەردوام دەبێت تا ڕۆی کۆتای، خواوەند هەمان شتی لەگەڵ سەرتاسەری پەیامبەر و نێردراوەکانی خواوەندا کردووە. خواوەند پێی بەخشیوین تا چەرخی زانین لە جووڵە نەوەستێت، ئەم چەرخە دەبەخشێت و بەردەوام دەبێت لەسەر بەخشین، کاتێك کەتۆ لێی وەردەگریت و دووبارە دەیبەخشیتەوە دەبێتە کەناڵێك بۆ گەیاندن لە خواوەندی وەردەگرێت و دەی دەیت بەوانی دی.

بەم شێوەیە تۆ دەبیتە کەناڵ، خۆش حاڵ بە بەوەی وەری دەگریت و خۆش حاڵیش بە بەوەی دەیبەخشیت. بەم شێوەیە ناکۆتایە لەبەر ئەوەی لە کاتدا بەردەوام دەبێت، جەستە دەڕوات بەڵام بیرۆکەکان کۆتاییان پێ نایەت. ڕێگای باڵا بوون پشت بەبیرۆکەکان دەبەستێت و پشت بەکەسەکان نابەستێت، کاتێك کەسێك دەمرێت بیرۆکەکانی دواییان دێت، بەڵام کەسی باڵا ئەی بەخشێت بە کەسێکی دیکە.

من دەمەوێت ئەم شتانەت لە یادبێت، دوای ئەوەی کە فێربوویت کێن دزەکانی سەرکەوتن و هۆکارەکانت لەبەرچاوگرت و پشتت بەست بەدروستکەری هۆکارەکان و فێری کارامەیی تەواوەتی بوویت و فێری پلانی ستراتیجی و کرداری ستراتیجی بوویت و ئاگادار بوویت لە کەوتنە ناو بۆسەی دزەکانی سەرکەوتنەوە، بەڵام سەرباری ئەو شتانەش هەندێ بابەتی دیکە هەر دەمێنێت.

گەنجەکە سەیرێکی کرد و ووتی: من ئەزانم کە کۆتایی بریتی یە لە سەرەتایەکی نوێ و سەرەتاش بریتی یە لە کۆتایی.

کەسی دانا ووتی: با بەردەوام بین لەسەر ڕێگەی باڵا بوون بۆ ئەوەی بگەینە سێ براکە کە ئەوانیش بریتین لە: پابەند بوون، سوور بوون و دسپلین.

دواتر لێرەدا کەسی دانا دەستی کورەکەی گرت و هەستی بە دڵسۆزی و نەوی بوون کرد، تائەو کاتەی کە گەنجەکە گریا و هەستی بە سوپاس گوزارییەکی زۆر کرد.

لێرەدا بۆ چەند ساتێك وەستا و سەیری ئاسمانی کرد کەسی داناش لەم ساتەدا بە جێی هێشت بۆ ئەوەی لە خەڵوەتی خۆدا بێت، دواتر گەنجەکە بەردەوام بوو لە سەر ڕۆیشتن.

کەسی دانا لێی پرسی: ئەوەی کە پێویست بوو کردت؟

گەنجەکە ووتی: سوپاسی خوام کرد، فرمێسك لە چاوی دا بوو. لێرەدا گەنجەکەش سەیری کەسی دانای کرد، بینی ئەویش چاوکانی تەڕبووە، لێرەدا گەنجەکە پرسی: بۆ ئەگریت؟

کەسی دانا ووتی: من ناگریم، ئەوە خۆشەویستی خوایە کەلەمندا هەڵ دەقوڵێت، لێرەدا هەردوو کەسەکە باوەشیان کرد بەیەکدا و دەستیان کرد بە ڕێ کردن لە ڕێگەی باڵا بوون دا، تاگەیشتنە ویستگەی دواتر، لێرەدا کەسی دانا ووتی: با باسی پابەند بوونت بۆ بکەم:

## پابەند بوون

پابەندبوون وادارت دەکات هەستیت لەو کاتەیا کە دەتەوێت بنویت.

پابەندبوون وادارت دەکات گرنگی بدەیت بە تەندروسیتی خۆت لە کاتێکا کە تۆ ناتەوێت هیچ کارێك بکەیت.

پابەند بوون وادارت دەکات کە بخوێنیتەوە لە کاتێکا ئارەزووی خوێندنەوە ناکەیت.

پابەندبوون ئەوەیە کە تۆ پابەندی ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە بیت و بەهێزبیت لەم جۆرە بیرکردنەوەیەدا و لەهیچ بارودۆخێك دا وێڵی نەکەیت.

گەنجەکە ووتی: کەواتە پابەندبوون لەوپەڕی بە هێزی دا.

کەسی دانا ووتی: بەڵێ.

## سووربوون

گەنجەکە ووتی: کەواتە سووربوون چی یە؟

کەسی دانا ووتی: سووربوون وادارت دەکات کەلەسەر پابەندبوون بەردەوام بیت، لەبەر ئەوە بارودۆخ هەرچۆنێك بێت تۆ دەبێت بەردەوام بیت لەسەر کارەکەت. لێرەدایە کەباس دێتە سەر سووربوون. من پابەندم بەوەی کە رۆژانە (١٠) خولەك بە پێ بڕۆم، سووریش دەبم لەسەر ئەو کارە بارودۆخ هەر چۆنێك بێت.



Scanned with CamScanner

**دسپلین**

گەنجەکە پرسی: ئەی دسپلین چی یە؟

کەسی دانا زەردەخەنەیەکی کرد و ووتی: دسپلین بریتی یە لە بەردەوام بوون، دسپلین سووربوون بەهێزتر دەکات، سووربوونیش پابەند بوون بە هێزتر دەکات لەبەر ئەوە من ناویانم لێ ناوە سێ براکە، دسپلین بریتی یە لە بەردەوام بوون لەسەر شتێك، لەبەر ئەوە پێغەمبەر (د . خ) پێمان دەڵێت کاتێك کە پرسیاری لێ دەکرێت: خواوەند کام کردەوەی زیادتر لەهەر کردەوەیەکی تر خۆش دەوێت، لەوەڵامدا دەڵێت: بەردەوام ترینیان ئەگەر چی کەمیش بێت . "بەڕیوایەتی بوخاری و موسلم".

ئەو شتە کەمەی کە ڕۆژانە بە یانیان دەیکەیت دەبێـتە بەشێك لە تۆ، ڕۆژانە ئەو شتە کەمەی کە دەیکەیت کۆ دەبێتەوە و گۆڕانی زۆر دروست دەکات.

ڕەوش بەم شێوەیە دەبێت، ئەمە ڕەوشی منە لەگەڵ ئامانجەکاندا، ئامانجێك و ئامانجێك و ئامانجێك کەلەسەر بنەمای مەبەستێك دروست کرابێت، دەتگەیەنێتە خەونە کانت، بەم شێوەیە سێ براکە: واتە پابەند بوون و سوور بوون و دسپلین دەبنە هۆکار بۆ ئەوەی کە تۆ لەژێر هیچ جۆرە گوشارێك دا دەست بەرداری خەونەکەت نەبیت.



Scanned with CamScanner

دواتر کەسی دا پێکەنی و ووتی: دووبارە پرسیاری ئەوم لێ نەکەیت کە ئەمە کۆتاییە یان نا، لەبەر ئەوەی ئەم پرسیارکردنەت وەك خووی لێ هاتووە.

گنجەکە ووتی: نەزانم کەئەمە سەرەتایە، سەرەتای تازە ترمان چی دەبێت؟

کەسی دانا ووتی: نەرمی تەواوەتی، ئەمەش بە مانای ئەوەیە کە تۆ دەبێت ئامادەیی ئەوەت تێدا بێت کە لە ژیاندا نەرم بیت و زۆر زوو لەگەڵ هەل و مەرجی نوێدا خۆت بگونجێنیت، بۆ نمونە ڕەنگە تۆ پابەند بیت بە شتێکەوە و سووربیت لەسەری و دسپلینت هەبێت، بەڵام لە هەمانکاتدا تۆ ڕێگەی هەڵەت گرتبێت و ڕێگەی دروستت لە یاد چووبێتەوە، ڕەنگە لەورێگە هەڵەیەی کەهەڵتبژاردوو لابدەیت و بکەویتە سەر لاڕێی دیکە و تیایدا وون بیت و پێشت وابیت کە تۆ ڕێگەی دروستت گرتۆتە بەر، لەبەر ئەوەی تۆ هەڵنەساویت بەکاری هەڵسەنگاندن هەروەك چۆن لە پلان دانانی ئیستراتیجی و کرداری ئیستراتیجی باسمان لێوەکرد، تۆ هەڵنەساویت بە هەڵسەنگاندنی ڕێگاکەت تۆ دڵت خۆش بووە بە دەستکەوتەکانت، بەم شێوەیە تۆ ڕێگەی نەهریمەن دەگریتە بەر لەبەر ئەوەی دڵت خۆش بووە بەوەی بەدەستت هێناوە ولە یادت کردووە کە سوپاسی پەروەردگار بکەیت، بۆیە لە ناو هۆکارەکاندا وون بوویت، شەیدای هۆکارەکان بوویت و لە ناو هۆکارەکاندا کۆتاییت پێ هاتووە.

بەڵام خواوەند تۆی خۆش دەوێت، دەت وەستێنێت و شکست دەهێنیت، ئەم شکستە بەرەکەتێکە لە لایەن خواوەند بۆ تۆ، لەبەر ئەوەی کاتێك کە تۆ دەکەویت و نەخۆش دەکەویت، ئەم نەخۆش کەوتنەش بەرەکەتە، یاخود گەر ئازار بچێژیت، ئەو ئازارەش بەرەکەت، لەبەر ئەوە لە کاتەکانی نەخۆشکەوتن و ئازار و شکستایە کە ئومێد دروست دەبێت، گەر ئازار نەبوایە ئومێدیش دروست نەدەبوو، گەر زانست دروست نەبوایە کاریش دروست نەدەبوو، گەر ڕۆیشتن نەبوایە هیچ کات نەدەگەیشتین لەبەر ئەوە ئەم تەنگ و چەڵەمانە سەرەتان بۆ گەیشتن بەو شتەی کە دەمانەوێت.

ئەوەت لە یادبێت ئەی کوڕی گەنج کەئەگەر پێچەوانەی مانا نەبوایە، هیچ کات مانا خاوەنی مانا نەدەبوو، گەر ئازار نەبوایە ئیسراحەت کردن بوونی نەدەبوو، گەر شکست نەبوایە سەرکەوتن بوونی نەدەبوو، گەر شەو نەبوایە ڕۆژ مانای نەدەبوو، گەر نەخۆشی نەبوایە تەندروستی مانای نەدەبوو، گەر تەنگانە نەبوایە کرانەوە مانای نەدەبوو. تەنگانە بەری کورتە و فەرحی بەری دیاری کراو نی یە، ئەگەر تەنگانە نەبێت فەرحی هیچ مانایەکی نامێنێت، ئەو کەسەی کە بەردەوام لە فەرحی دا بێت هەست بە تەنگانە ناکات، کەواتە پێویستە کە تەنگانەش هەبێت تا کەسەکە چێژ لە فەرحی وەربگرێت، تەنگانەش سوودی خۆی هەیە.

گەنجەکە سەری سوڕما و ووتی: ئایا تەنگانە و ماندووبوون سوودی هەیە؟

کەسی دانا وەڵامی دایەوە: بەڵێ، کاتێك کەلە تەنگانە دایت دەڵێیت ئەی خوایە، خواوەندیش وەڵامی داواکارییەکەت دەداتەوە کاتێك کەلەتەنگانەدایت بەشێوەیەکی جیاواز بیردەکەیتەوە بۆ ئەوەی لە ناخۆشی یەکە بێیتە دەرەوە، کاتێك کەلە تەنگانە دایت پەزە بەبیرۆکەکانت دەدیت کەواتە تەنگانە سوودی هەیە، هەر لە تەنگانەوەیە کە دەچیتە فەرحی یەوە کەواتە پێویستە کە نەرم و لواو بیت.

گەنجەکە ووتی: جیاوازی چی یە لە نێوان نەرمی و وون بوون لە ڕێگادا ؟

کەسی دانا ووتی: پابەند بوون و سوور بوون و دسپلین بە ئامانجەکەتەوە، بەڵام ئەو شێوزەی کە هەڵی دەبژێریت بانەرم و لواو بێت، لەبەر ئەوەی ڕەنگە زیاد لەڕێگایەك هەڵبژێریت تا دەگەیتە ئەو سەرکەوتن و جیاوازییەی کە دەتەوێت، کەواتە نەرمی و لواوی ڕەوشە، پابەند بوون و سوور بوون و دسپلین لە ئامانجدا مانای ئەوەیە کە نابێت بە هیچ شێوەیەك دەست بەرداری ئامانجەکەت بیت، بەڵام با ئەو ڕەوشەی کە هەڵی دەبژێریت نەرم و لواو بێت، لێرەوە بابچینە وێستگەی دواتر.

لێرەدا گەنجەکە لەگەڵ کەسی دانادا ڕێی کرد و ئەمجارەیان هیچی نەوت. بەڵام لە ناخی دا ناوی خواوەندی دەهێنا و سوپاسی دەکرد. زەردەخەنەیەك لەسەر لێوی بوو، چاوەکانی پڕ بوو لە فرمێسکەکانی خۆشەویستی خواوەند، هەردووکیان پێکەوە گەیشتنە وێستگەی دواتر. لێرەدا کەسی دانا وەستا و سەیری گەنجەکەی کرد و پێی ووت:

ئێستا کاتی ئەوە هاتووە کە یارمەتی زۆرترین ژمارە لە خەڵکی بدەیت ئەوەی کە خواوەند پێی بەخشیویت موڵکی خۆت نی یە، بۆت هەیە کە چێژی لێوەرگریت، بەڵام کاتێك کەدەیبەخشیت خۆشی و چێژەکەی زیاد و زیادتر دەبێت، بەمە دەوترێت ئاسوودەی ئەی کوڕی خۆم. بۆ ئەوەی ئاسوودەیی بکەیتە خوو، پێویستە بەردەوام لە خۆشەویستی خواوەند دابیت. لەبەر ئەوە کاتێك کە یارمەتی خەڵکی دەدەیت هەست بەم خۆشی یە دەکەیت، لبەر ئەوە یارمەتی زۆرترین ژمارە لە خەڵکی بدە بە زانستەکەت... بە بیرکرنەوەت، هەروەك چۆن من بەو بیرکردنەوە و زانستەی خۆم کەخواوەند پێی بەخشیوم یارمەتیت دەدەم هەر لە یەکەمین ساتەوە و لەگەڵ فێربوون دا فێر بکە، هەر کە دەستت کەوت ببەخشە، ئەوەشت لە یاد بێت کە ئێمە دەژین – بەیاری یەزدا- بۆ ئەوەی بتوانین بژێوی خۆمان دابین بکەین و لە کاتی بەخشین دا ژیانمان بە باشترین شێوە دروست بکەین.

لێرەدا گەنجەکە سەیرێکی کەسی دانای کرد بە چاوێك کە پڕ بوو لە خۆشەویستی و پێ زانین بۆ ئەو هەموو زانستە، بۆئەو پشوو درێژی

یه، بۆ ئەو هەموو زانستە، بۆ ئەو سوور بوونە، بۆ ئەو دسلپینە و بۆ ئەو مامەڵە نەرم و لواوەی کەلەگەڵ ئەو گەنجە وون و سەر لێشێواوەدا دەیکرد دواتر گەنجەکە ووتی: ئەمە پەیمانبێت.

کەسی دانا ووتی: پەیمان مەدە.

گەنجەکە ووتی: بەڵام من سوورم لەسەر ئەو پەیمانە، هەرچەندە ڕوو بەڕوو بوونەوەکان بە هێزبن و هەل و مەرجکان سەختتر، من دەستبەرداری پەیوەندی خۆم نابم لەگەڵ پەروەردگاردا، تەنها بۆ ساتێکیش لە زیکری خوا غافڵ نابم، ئەمە پەیمانێکە لە منەوە .

لە ڕۆژێکدا دوو ڕکات نوێژی سوپاسی خوا ئەکەم، بۆ ساتێکیش غافڵ نابم لەوەی کە داوای تەمەن درێژیت لە خواوەند بۆ بکەم و لێی بپاڕێمەوە کە تەندروستیت پێ ببەخشێت و زانستت زیاد بکات و زانستێکت بداتێ کە تەنها خۆت خاوەنی بیت و کەسی تر نەی زانێت لەم سەردەمەدا. هەروەها ئیسلام و موسڵمانەکان و عەرەب و زانستەکانیش سوودت لێ وەرگرن هەروەها زانستەکەشت لەسەر زەوی بڵاوببێتەوە و منیش ئەبم بەخزمەت کارت – بەیاری یەزدان- وەلەم ڕۆ بەدواوە بۆ تەنها ساتێکیش وازت لێ ناهێنم، ئایا ئەم کەیت بە یەکێك لە قوتابیەکانت؟

لێرەدا کەسی دانا باوەشی پیدا کرد و ووتی: کەواتە تۆ ئەو دیارییەی کە خواوەند بە منی بەخشیوە، پەیمان بێت ئەی کوڕی گەنج"من هیچ کات پەیمان نادەم" کە من هیچ کات تۆ بە جێ نەهێڵم "بە یاری



Scanned with CamScanner

یەزدان" تا تۆ لەسەر پەیمانی خۆت بیت. ئەوەی کە من کردم لەگەڵ تۆدا لە یادت نەچێت، هاوڕێ کانت لەگەڵ خۆت دا ببە، هەروەها قوتابیەکانیشت ببە، زۆرترین کەس لەوانەی کە دەی ناسیت ببە و فێریان بکە کە ڕێگەی باڵا بوون بریتی یە لە ڕێگەی گەیشتن بە خواوەند، هەوەها فێریان بکە هۆکارەکان دەگەڕێنەوە سەر سەرچاوەی هۆکارەکان، هەروەها فێریان بکە کە ئەگەرەکان لە تواناکانەوە سەرچاوە دەگرن، کەواتە باشتر وایە مرۆڤ زۆر سەوداسەری تواناکانی خۆی نەبێت، هەروەها زۆر سەودای هۆکارەکانی خۆی نەبێت، بەڵام دەبێت بزانێت کە خاوەنی ئەم هێزانە یەکە و ئەو هێزەی پێ بەخشیوین بۆئەوەی بگەین بەم توانایانە، هەر لەو ڕێ یەوە بووە کە توانیومانە بگەینە سەرچاوەکان بەم شێوەیە تۆ سەرچاوەکانت فێر دەکەیت کە فێری زۆرترین ژمارە لەخەڵکی بکەن بەم شێوەیە تۆ دەبیتە مژدەهێن بە یاری یەزادن.

ئەوەشت لە یاد بێت ئەی کوڕی گەنج کە ڕێز لە هەموو ئاینەکان بگریت و کەسێکی هاوسەنگ بیت، هەروەها لەو کەسانە بیت کە مزگێنی بڵاو دەکەنەوە هەمیشەش بازەردەخەنە لەسەر لێوت بێت، ئەوەشت لەیاد بێت کە خواوەند لەبەر هەر هۆیەك بێت تۆی کردووە بە جێگری خۆی لەسەر زەوی تۆش ئەم هەستە بگوازەرەوە بۆ کەسەکانی دی.



Scanned with CamScanner

لە یادت بێت ئەی کوڕی گەنج ئەی هاوڕێ ئەی دۆست کە نە ناوی تۆ، نەناوی خێزانەکەت، نەدرێژیت، نە سامانەکەت، نە پلەوپایەکەت، نەئەوەی کە تۆ کێیت و نە ئەوەی کە تۆ چیت و چی بوویت، ئەمانە تێکڕا گرنگ نین و سەرجەم هۆکارن، کەواتە تۆ کێیت؟ تۆ باشترین دروستکراوی خواوەندیت، ئەو خواوەندەی دروستی کردوویت، تۆ ئەو کەسەیت کە خواوەند زەوی و ئاسمانی خستۆتە ئیختیارتەوە، تۆ ئەو کەسەیت کە خواوەند تۆی کردووە بە جێگری خۆی لەسەر زەوی تۆ ئەو توانا بێ کۆتایەیت. تۆ پەرجوویت، پەرجووش سنووری نیە. ئەوە تۆیت بۆیە بەشێوەیەك بژی کە ڕەنگە ئەم ئەم ساتە دوا ساتی ژیانت بێت. کەواتە بە خۆشەویستی خۆت و دڵسۆزی و نیەت پاکی و گوێڕایەڵی خۆت بۆ خواوەند بژی، دواتر خووەکانی پەیامبەر لە خۆ بگرە کە دەڵێت: تۆ خاوەن ئاکارێکی زۆر مەزن و گەورەیت. هەروەها لە شوێنێکی تردا دەفەرموێت: من نێردراوم بۆ ئەوەی ئاکاری جوان تەواو بکەم. دایکیشم خوا لێی خۆش بێت دەیوت: خوایە سیمات بکات بە خشڵێکی پڕ بەها و زمانت بکات بە شەکر. کەواتە ئەی کوڕی گەنج بەشێوەیەك لەم ساتەدا بژی کە ئینگار دواهەمین ساتی ژیانتە، ئاکاری پەیامبەر وەربگرە، پەیامبەر و نێردرا و پیاوچاکان، دواتر لە ڕێی ململانێ وە بژی، بەکردار بژی، بە پابەند بوونەوە بژی، بە پشوو درێژی یەوە بژی، بە لواوی و نەرمی بە خۆشویستن و ئومێدەوە بژی لە کۆتاییشدا بەهای ژیانت لە لابێت . ئێستا بابرۆین لە بەرئەوەی

ئێمە گەیشتووینەتە کۆتای لە ڕێگەی باڵا بووندا و بۆ ئەوەش کە ڕێگەیەکی نوێ بدۆزینەوە لە ڕێگەی خواوەند دا.

سڵاوو ڕەحمەتی خوای گەورە و پیرۆزتان لێ بێت



Scanned with CamScanner

# THE PATHWAV TO EXCELLENCE

باشە ئەبێت هۆی سەرکەوتنی هەندێک کەس و سەرنەکەوتنی هەندێکی تر بگەڕێتەوە بۆچی؟! جیاوازی کەسە سەرکەوتووەکان لە چیدایە و بە چی جیا ئەکرێنەوە؟! هەندێک ژیانی بەباشترین شێوە ئەباتە سەر و خەون و ئامانجەکانیان بەدی دەهێنن لە کاتێکدا کەسانێک هەن کە بە پێچەوانەوەن؟! ئایا ئەو کەسانەی کە بەپێی خواست و ئارەزووی خۆیان ئاژین و خەون و ئامانجەکانیان بەدی ناهێنن نایانەوێت ئاسوودە بژین؟! نایانەوێت کەسێکی باڵا بن؟! بەدڵنیاییەوە نەخێر .....!!

لەبڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما
نرخ (3000) دینار

Scanned with CamScanner